# پێشەکی

**ئەم نامیلکەیە وتارێکی "د. سروش"ە کە لە مانگی 12ی ساڵی 2018 لە ژێر ناونیشانی "علم و دین" تۆمار کراوە، کە پێکهاتووە لە دوو بەش:**

**بەشی یەکەم (لا.4 - 24): باس لە کورتە مێژوویەکی مشتومڕەکانی نێوان زانست و ئایین دەکات. هەروەها چەند تیۆری و پرسیارێکیش دەخاتە ڕوو...**

**بەشی دووەم (لا.25 - 53): دەست دەکات بە شیکارکردنی تیۆرییەکان و وەڵامدانەوەی پرسیارەکان.**

سوبحان ئەو خودایە کە ئەقڵی پەیەمبەران
دەرکی نیانە غەیری بە بەردەرکیا گەڕان

سوبحان ئەو خودایە کە داناتری زەمان
دێوانەیە و لە مەعریفەتی کونهیا نەزان

سوبحان ئەو خودایە کە کەڕڕووبییانی عەرش
وەک ناسی قوڕ بەسەر بە نەناسینی موبتەلان

زەرڕڕێکی چون ئیحاتە چییە نیسبەتی لەگەڵ
ڕۆژێکی بێ نیهایەت و بێچوون و بێ چونان

مەحوی

# بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

## بەشی یەکەم

گوئی کە نگون کردە است ایوان فلک‌وش را

حکم فلک گردان یا حکم فلک گردان

ئەمە بەیتێکە لە قەسیدەیەکی "خاقانی" کە خاڵێکی قوڵی فەلسەفی لەخۆگرتووە و پەیوەندییەکەی تەواوی لەگەڵ باسەکەی ئێمەدا هەیە. خاقانی کاتێك کە ئەیوانی کەسرا (کۆشکی کیسرا) دەبینێ وێران بووە، پرسیار دەکات: "کە وێرانکەری ئەم ئەیوانە وێرانە کێیە؟" ئەمە ڕێك مشتومڕی نێوان زانست و ئایینە، ڕێك مشتومڕی نێوان ئەقڵ و وەحییە. بە گوتەی "لیۆئێشتراز" فیلسوفی سیاسی ئەڵمانی، دوو لۆژیك یان دوو فەلسەفە هەیە کە سەرچاوە و دەستپێکەری یەکەمیان "ئەسینا" بوو و ئەوی تریشیان "ئورشەلیم". ئەسینای فیلسوفان و ئورشەلیمی پێغەمبەران. ئێمە دەتوانین بە دوو جۆر باس لە ڕووداوەکان بکەین: یان ئەوەی بڵێین یەك "فەلەك گەردان" هەیە کە گەردون هەڵدەسوڕێنێ، یانی هەموو شتێکی بەدەستە و تەگبیری کاروبارەکانی جیهان دەکات و سروشت لەژێر کۆنترۆڵ و لەناو دەستانی ئەودایە، واتە خودا؛ یان " فەلکی گەردان" واتە خودی سروشت ئەم کارانە ئەنجام دەدات، کە پێویست بە بونەوەرێك یان هێزێکی دەرەوەی سروشت نییە کە بگەڕێین و بیدۆزینەوە و بڵێین ئەوە ئەو بوونەوەرە دەرەکیەیە کە سەرچاوەی جوڵە و ڕوداوەکان و هێزی بزوێنی جیهانە. کەوابوو یا " فەلەك گەردان" یان "فەلەکی گەردان". ئەگەر شوێن "فەلەك گەردان" بکەوی واتە شوێن خودا کەوتووی و ئەگەر شوێن "فەلکی گەردان" بکەوی بە بێ پێویست بوون بە "فەلەك گەردان" ئەو کات تۆ شوێن سروشت کەوتووی، واتە یەك "ناچراڵییستی"، یان یەك ماتریالیستی یان یەك فییزکاڵیستی. کەسێکی کە پێت وایە جیهان خۆی خۆی بەڕێوە دەبات و پێویستی بە بەڕێوەبەرێکی دەرەکی نییە.

من لێرەدا دوو دەستەواژەی "زانست" و "ئایین"م بەکارهێناوە، ئەم دوو دەستەواژەیە تا ڕادەیەك نوێن، چەند دەیەیەك بەر لە ئێستا لەناو ئەو کتێبانەی کە هەر لەم بوارەدا دەنوسرانەوە، ئەم بابەتەیان لەژێر ناونیشانی "ئەقڵ" و "وەحی" دەخستە بەرباس. هەڵبەت هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ دەستەواژەکانی زانست و ئاییندا نییە، بەڵام بازنەیەکی فراوانتریان گرتۆتەوە و لە هەمان کاتیشدا لەجیاتی ئەوەی ئاماژە بە بەرهەمی عەقل و وەحی بکەن، ئاماژە بە خودی ئەقل و وەحی دەکەن. واتە هێزی "ئەقڵ" و هێزی "بینایی" (دیتنی راستی لە دڵدا، واتە شهود). کە یەکیان ئاوەزپەسەند (معقولات)مان بۆ تەیار دەکات و ئەوی تریشیان کە هێزی بینایی (شهود)ە دەستکەوتەکانی وەحییمان بۆ بەدی دەهێنێ. ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەر وتەکەی "لیۆئیشتراز" و چاوێك لە بەرهەمەکانی بکەین، هەروەك من لە یەکێك لە وتارەکانی پێشترم باسم کردووە، ئەو دەڵێ: "خوداوەند بە دوو زمان لەگەڵ خەڵك قسە دەکات؛ یەکەمیان بە زمانی فیلسوفەکانە کە ناوەندەکەی ئەسینا بووە واتە یونانی کۆن، ئەوی دیکەشیان زمانی پێغەمبەرانە کە ناوەندەکەی ئورشەلیم، فەلەستین یان کەنعان بووە." ئەم دوو ناوچەیە بە شێوەیەکی سەیروسەمەرە وەك ئەوەی بلێی لە لایەن "فەلەك گەردان" یان "فەلەکی گەردان" دیاری کراون بۆ ئەوەی دوو شتی لێك جیاوازی وەکوو زانایی (دانش) و بینایی (بینش) لەگەڵ خەڵکی بخەنە بەر باس. یەکیان یونان بوو کە فەلسفەی وەکوو دیاری بۆ مرۆڤایەتی هێنا و لە 2500 ساڵ لەمەوبەر تا ئەمڕۆکە هەر سەرچاوەیەکی هەڵقوڵاو و زیندووە کە هەموو فیلسوفەکانی لە دوای ئەفلاتۆن و ئەرەستۆوە هاتوون، لەسەر سفرە و خوانی ئەمان دانیشتوون و خواردن لەمان وەردەگرن و تێر دەبن، ئەم سەرچاوەیە هێشتا بەردەوامە و لەبن نەهاتووە. ناوەند و سەرچاوەکەی دیکەش ئورشەلیم بووە کە نزیك بە "حیجازە" کە پێغەمبەری ئیسلام لەوێ سەریهەڵدا.

ئایینە ئیبراهیمییەکان کە ئیبراهیم، نوح، داود، سولەیمان، موسا و عیسا (سەلامی خوایان لێ بێت) هەموویان لەوێدا سەریان هەڵداوە. ئەوەی کە قورئان ئەو خاکە بە پیرۆز ناو دەبات، لەبەر ئەم هۆکارەیە، واتە هەموو بەرکەتەکان لەوێڕا بەسەر هەموو خەڵکی جیهاندا بارییون. گەرچی پیغەمبەری ئیسلام (د.خ) لەو ناوچەیە لەدایك نەبوو، بەڵام هەر وەك هەمووتان دەزانن میعراجی پێغەمبەر بە شێوەی "سیمبولییك" لەو سەرزەوییەدا بووە، واتە هەموو ڕیوایەتە ئاینییەکان بە سونە و شیعەشەوە پێمان دەڵێن کە پێغەمبەر لە مەککەڕا بەرەو "بیت

المقدس" ڕۆشت و هەر وەك دەگێڕنەوە لەوێڕا بوو كە قادرمەیەكی ئاڵتونییان بۆ دانا كە پێیدا بەسەركەوێ و بەرەو جیهانی غەیب بڕوات، هەڵبەت ئەمانە هەموو فەزایەكی "خەون بینین" بووە. ئەو زەوییە پیرۆزە بەرهەمێك یان دەرئەنجامێكی دیكەی هەبوو كە لەگەڵ دەستكەوت و دەرئەنجامەكانی فیلسوفان جیاوازی هەبووە. دواتریش لەگەڵ یەكدا تێكگیران، مشتومڕ و شەڕ لە نیوانیاندا دروست بوو. مشتومڕێك كە تا ئەمڕۆكەش هەر بەردەوامە. ئێستا دەمانهەوێ جارێكی دیكە بەم مشتومڕ و شەڕانەدا بچینەوە بۆ ئەوەی بزانین لە نێوان ئەم دووانە چی ڕویداوە و چی تێپەڕیوە، بابەتە لێكچووەكان و بابەتە جیاوازەكانی نێوانیان چیین؟ تا ئەو جێگایەی مێشكمان بڕی دەكات بزانین داهاتووی مرۆڤ به هۆی پڕیشكی شەڕی نێوان ئەم دووانە بە كوێ دەگات؟ ناوێكی دیكە كە عاریفەكانی ئێمە بۆ ئەم دوو ئوردوگایەیان داناوە، ئوردوگای "زانایی" و ئوردوگای "بینایی" یە. مولانا بە ئاشكرا دەڵێ:

هركه در خلوت به بينش يافت راه
او ز دانش هـــــا نجويد دستگاه
با جمال جـــان چو شد همكاسه ى
آ يدش ز اخبـــار و دانش تاسه ى

زاناییمان هەیە و بینایی، زانست لە لای زاناكان یان لای فیلسوفەكان دەستدەكەوێ و بیناییش لە لای پێغەمبەران یان لای عاریفەكان دەستدەكەوێ. عەسڵ وایە كە لەنیوان ئەم دوانەدا هیـچ مشتومڕێك نەبێ، بەڵام لە كردەوەدا ئەم مشتومڕە پێشهاتووە، كەم كەمیش هەر زیادی كردووە تا گەیشتۆتە سەردەمی ئێمە. تاكو بەر لە "ڕینسانس" كە لە ئەوروپا ڕوویدا، زاڵ بوون لای ئەندێشەی ئایینی بووە، واتە ئەو قوتابخانەیەی كە پێغەمبەران بونیادیان نابوو، كەم و زۆر ئەم قوتابخانەیە بۆ مرۆڤەكان لەو ناوچە ئایینیانە تاكە سەرچاوە بووە، واتە لە هەموو بوارێك پشتیان بەم سەرچاوەیە دەبەست. زانست، مێژوو، فەلسەفە و ئەركە ئایینیەكانیان هەموو لەوێ وەردەگرت و خوداشیان هەر لەو ڕێگەیەوە دەناسی، و زۆریش خەیاڵیان ئاسودە بوو لەبەرئەوەی، سەعدی گوتەنی:

**مالك خود را همیشه غصه** گدازد

**ملکی پری پیکری شدیم و برستیم**

**کاتێك مرۆڤ بە تەواوی خۆی دەداتە دەست کەسێك ئەو کات خەیاڵی ئاسودە دەبێ. دەڵێ لە جیاتی من تۆ بلێ، لە جیاتی من تۆ بیربکەوە، لە جیاتی من تۆ شیکاریی بکە، ئەم خەیاڵ ئاسوودەییە رەزامەندی دەدات بە مرۆڤ و ئەم رازی بوونەش لە لای پێشینیان بوونی هەبووە. لە رێنسانس بە دواوە هەر وەکوو هەمووومان دەزانین بارودۆخەکە ئاڵوگۆڕی بەخۆیەوە بینی، رکابەرێکی بەهێز بۆ ئایین پەیدا بوو بە ناوی زانست، "زانستی ئەزمونی". نالێین کە پێشتر ئایین هیچ رکابەرێکی نەبووە، هەیبوو، بلام هیچ کات ئەوەندەی ئەم ڕکابەرە "زانست" بەهێز نەبووە. رکابەری پێشوتر هەمان فەلسەفە بوو کە باسمان کرد، هەمان زانستی یونانی بوو، ئەویش لەبەرامبەر ئایین خۆی ڕاستکردبووەوە، کەسانێك بوون کە روویان لەو دەکرد، روگەیان زانستێك بوو کە مرۆڤ وەدی هێنابوو.**

**لە نێوان فیلسوفانی ئیسلامی کەسێك هەبوو کە زۆر هۆگری ئەرەستۆش بوو بە ناوی "ابو الولید ابن رشد" فیلسوفی سەدەی هەشتەم لە ئەندەلوس. لە رۆژئاوا ئەو زیاتر لە هەر فیلسوفێکی دیکەی ئیسلامی ناسراوە. ئیبن روشد کتێبێکی زۆر گرنگی هەیە کە بۆ زۆر زمانی دیکەش وەرگێڕدراوە. کتێبەکە ناوی" فصل المقال فیما بین الحکمە و الشریعە من الاتصال"ە. ئەم کتێبە لە بارەی پەیوەندی نێوان حیکمەت و شەریعەتە، واتە فەلسەفە و ئایین. ئەمە بابەتێکی بەرچاو بوو لەو سەردەمەدا، کە ئایا ئایین کامڵ نییە؟ ئایا پێغەمبەران هەموو شتێکیان فێری ئێمە نەکردووە؟ ئایا ئێمە پێویستمان بە دەرەوەی ئایینیش هەیە؟ و ئەگەر پێویستمان بە دەرووەوەی ئایین هەبێ کام لە فێرکارەکان جێگای متمانەن کە دەکرێ ڕوویان تێ بکەین؟ ئەگەر ناکۆکی کەوتە نێوان ئایین و فەلسەفە ئەوکات دەبێ چی بکەین؟ لایەنگری کامیان بین؟ چونکە یەکێکیان ئەقڵە و ئەوی دیکەیان وەحییە، بە شێوەی ئایدیاڵ ئەمانە دەبێ لەگەڵ یەکتر سازگار بن، بەلام ئەگەر ناسازگارییەك هاتە پێشەوە، ئەوکات دەبێ چی بکەین؟ ئیبن روشد لەوێدا بە بیری خۆی ڕێگا چارەیەك دەخاتە ڕوو: ئەویش ڕەپاڵدانی نیوان حیکمەت و شەریعەتە.**

ئیبن روشد لە دوای "ئیمامی غزالی" هات.  ئیمامی غەزالی ئەو کەسە بوو کە بە شێوەی فەرمی چەند فیلسوفێکی تەکفیر کرد. دەیگوت ڕوانگەکانی ئەوان سەد لە سەد دژ بە ئایینن و ئەگەر وابێ ئەم ڕوانگانە بێ باوەڕیین. "ئیبن سینا" و "فارابی" لەوانە بوون کە ئیمامی غەزالی مەبەستی بوون.  لەبارەی بابەتانێکی  وەکوو" تازە و کۆنی" جیهان و "زانستی خودا"،  ئەم فیلسوفانە بە ئاشکرا دەیانگوت خوداوەند زانستی وردەکاری"جوزئیات"ی نییە یان گرنگی پێنادات، واتە خوداوەند ئاگاداری ئەوە نیە کە ئێمە لێرەدا دانیشتوین و کۆڕێکمان گرتووە، بەڵکو زانستی گشتی "کلیات"ی هەیە، لەبەر هەندێ زانستی خودا پەیوەندی نییە بەوەی کە فلان کەس، لە فلان شوێنە و فلان سات چی کردووە، چونکە ئەوان بە پێویستیان دەزانی کە دەبێ لە زاتی خودا فرەیی دروست ببێت و ئەمانە ناسازگارن لەگەڵ "واجب والوجود"ی پەروەدگاردا، بۆیە نکۆڵی ئەم بابەتەیان دەکرد. غەزالی بە ئاشکرا دەیگوت کە  قورئان پێمان دەڵێ: "کە هیچ شتێك لە زانستی خودا شاراوە نییە، ئەم فەلسەفە ناتوانێ لەگەل ئایین هاوڕا بێت. لەبەرئەوە بۆ ئیمانداران وەلانانی ئەم فەلسەفەیە پێویستە." بە شێوەیەك کە لە جیهانی ئیسلام کەسانێك سەریانهەڵدا کە ئێستاش هەر بوونیان هەیە، فەلسفەی یونانی و فەلسەفەی ڕوژئاوایی بە ناوی ئایینەوە ڕەد دەکەنەوە یان لە خۆیانی دووردەخەنەوە. هەروەها لە بیروباوەڕی ئەوانەدا: "ئایین زۆرترین ڕادە (ماکزیمۆم)ی لەلا هەیە، واتە ئایین هەموو شتێکی پێویستی لە خۆیدا هەیە، تۆ هەر چییەکت پێویست بێ بۆ کامەرانی، بۆ ڕێنمایی،  بۆ ناسینی خودا و بۆ ناسینی جیهان دەتوانی لە ئایینەوە  فێری ببیت. فیلسوف کێیە کە بێت بە ئێمە بڵێ خودا کێیە یان ئەوان بێن خودامان پێ بناسێنن، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ قورئان و فەرمودە." هەتا ئەو ئاوازەی کە دەیانهەوێ "زانستە مرۆییەکان"یش بە ئایینی بکرێن و لە وڵاتی ئێمەدا "ئێران"بوونی هەیە و حکومەتیش پشتگیری لێدەکات، کە ئەو بیرۆکەیەش لایەنگران و بەرهەڵسکارانی خۆی هەیە و حکومەتیش لە پشت لایەنگرانی ئەم ئەندێشە پوچەڵ و لاوازە وەستاوە، ئەم ئاوازە هەر لەو سەرچاوەوە سەریهەڵداوە، کە دەڵێن:"خەڵکی دیکە چ کارەن کە زانستی مرۆیی بۆ ئێمە بنووسنەوە، زانستی مرۆیی خومان دەینوسین، لەبەرئەوەی ئایین  فێری کردووین کە مرۆڤ کێیە. لە بنچینەدا ئەوەی کە مرۆڤ کێیە دەبێ ئەمە لە پێغەمبەر ببیستین نەوەك لە کەسانێك کە مێشکیان بە هەموو جۆرە پیسی و هەوەسێك ئاڵوودە بووە کە ئەوان بێن و بیانهەوێ مرۆڤ ناسیمان فێربکەن."

دەبینی کە مشتومەڕەکە زۆر زیندووە و لە هەر شوێنێکدا بە شێوەیەکی جیاواز خۆی نیشان دەدات و روخساری خۆی دەردەخات. سەردەمی ئێمە سەردەمی هزری زانستییە. لە لایەکی دیکەشەوە کەسانێك دەرکەوتوون کە بە ئاشکرا بانگەشەی خودانەناسی دەکەن. خودانەناسان "atheists"، ئەوانەی کە باوەڕیان بە مێتافیزیك یان باوەڕیان بە خودا، موعجیزە، وەحی و ئەو شتانە نییە، هەمیشە هەبوونە، هەتا لە نێوان فیلسوفانی پێشتریش، بەڵام ئەمرۆ بە پشتیوانی زانست کەسانێك سەریانهەڵداوە و باوەڕیان وایە کە زانست بە شێوەی جیددی و یەکجارەکی پێمان نیشان دەدات کە ئێمە لە تێگەیشتن و دەرککردنی جیهان هەروەها لە دیاریکردنی ئەرکە ئەخلاقییەکانی خۆشمان لەم جیهانەدا، هیچ پێویستییەکمان نە بە خودا هەیە و نە بە ئایین، واتە کامڵبوون لە زانستدا دەبینن. ڕێك هەمان ئەو خەسڵەتەیان هەیە کە پێشینان باوەڕییان بەرامبەر بە ئایین وابوو، بەڵام ئەمان بەرامبەر زانست بەم جۆرەن. کە زانست یان هەموو بابەتەکانی چارەسەر کردووە یان لە داهاتوتدا بێگومان چارەسەریان دەکات، ئومێدێکی لەم جۆرەیان هەیە. تا ئەمرۆکەش زۆر بابەتی حەل نەکراوەی پێش خۆیان چارەسەر کردووە و وڵامەکانیان خستۆتە بەردەستی ئێمە و پێویستی ئێمەیان بۆ ئایین وەلاناوە. ئەم ناوکەپەتکەی مرۆڤ کە ئەگەر لە وەحی بپچڕێ و گرێ بدرێت بە ئەقڵەوە، پێی دەڵێن "سیکۆلاریزاسیۆن". باوەڕیان وایە لەبەرئەوەی ئەم سیکۆرلاریزەیشنە لە حاڵەتی پێشکەوتنە نیشانەی ئەوەیە کە ئایین یان وەحی لە بەرەو پاش چوونە، ئەوکات ئایین جێگای خۆی دەدات بە پێشکەوتنەکانی زانست.

ئێوە دەبینن کە ئێستا لە قوتابخانەکان کەس فێری موعجیزە ناکەن، نایەن باسی ئەوە بکەن کە تۆفانی نوّح چۆن ڕوویداوە، یاخود نایەن کتێبە پیرۆزەکان لە قوتابخانەکان بەخنە بەر باس، نایەن پێداچوونەوە بۆ مێژوو بکەن لەسەر بنەمای ئایین کە خوداوەند جیهانی کۆنترۆل کردووە و تێیدا بەشدارە. نایەن بڵێن لە فلان شوێنە خوداوەند لافاوێکی ناردووە تا فلان نەتەوە لە ناو بەرێت، یان لە فلان شوێن هەورە بروسکەی نارد یان لە فلان شوێن عەزابی نازل کردووە، هیچ کام لەم وتانە لە کتێبە زانستیەکانی خوێندن لە ناوەندییەوە بگرە تا زانکۆ بوونی نییە. واتە بیر یا زەینی ئێمە، ئەوانەی کە لە قوتابخانەکانی ئەمرۆ دەخوێنن، زەینێکە کە بە زانستی سێکولار شکڵی گرتووە. زانستی سێکولار واتە زانستێك کە ئاشکرا بووون یان پێشهاتنی هیچ کام لە ڕووداوەکانی جیهان ناداتە دەست هیچ هێزێکی غەیبی، بەڵکو دەرکەوتن و پێشهاتی ڕووداوەکان دەداتە دەست هێزەکانی سروشت و یاساکانی زانست.

دەیهەوێ لەم ڕێگەیەوە جیهان بۆ ئێمە وا لێبکات کە دەرکی بکەین و لێی تێبگەین. ئەم زانستەش سەرکەوتوو بووە، دەکرێ سەرکەوتنەکانیشی لەو بۆمبە ئەتۆمییانە ببینین کە دروستیان کردوون یا فرۆکە کە من و تۆ سواری دەبین و سەفەری پێ دەکەین، ئوتۆمبیل، دەرمان بۆ نەخۆشی، پێویست بە گوتنیان ناکات، چونکە بۆ هەمووومان ئاشکران.

هەریەك لەمانە نیشانەی سەرکەوتنی زانستە، لەبەرئەوە زانست لە کردەوەدا نیشانی داوە کە کارەکانی ئەفسانە نیین و مرۆڤەکان سەرقاڵ ناکات، بەڵکۆ ڕاستیەکان کەشف دەکات و ئەویش بە بێ ئەوەی لایەنگری هیچ لایەنێك بێت، و ئەم ڕاستیەش بەکار دەهێنێت هەروەها دایکی تێکنۆلۆژیاشە و تێکنۆلۆژیاش خزمەتکاری مرۆڤەکانە. کەوابوو زانستێك بەم پەتەویی و پشتیوانییەی کە هەیەتی، هەڵبەتە کە دەتوانێ وا لە مرڤەکان بگەیەنێت کە: "من هاتووم تا کێبڕکێکارانی خۆم لە گۆڕەپان وەدەرنێم وجێگای ئەوان بگرمەوە. ئەگەر ئەوان ئەفسانەیان بۆ ئێوە دەگوت، من ئێستا راستیەکان بە ئێوە دەڵێم. ئەگەر ئەوان دەیانگوت خودا باران دەنێرێ، من ئێستا پێتان دەڵێم باران چۆن دروست دەبێ، ئەگەر ئەوان دەیانگوت خودا لە ناو ڕەحمی دایك شکلی مرڤەکان دەکێشێ کە ئەم دەربڕینە لە قورئانیشدا هەیە "هو الذي يصوركم في الأرحام كيف يشاء..." (خودا چۆن بیهەوێ نەخشەی روخسارتان لە منداڵدانەکاندا دەکێشێ.) ئەمرۆ زانست دەڵێ پێویست بەم قسانە ناکات و لە بنەڕەتدا ئەم قسانە پەسەند کراو نین، بەڵکۆ ئێمە کاتێك دەگەین بە ژێنێتیك و کرۆمۆسۆمەکان کە "DNA"لە خۆدەگرن، ئێمە بە هۆی ئەمانەوە بە باشی دەزانین کە چ شتێك شکڵی مرۆڤ دروست دەکات هەتا لە رووی ئەو ژێنانەوە دەتوانین بزانین منداڵ تەندروست و ساغ لە دایك دەبێ یان کەم ئەندام، کەم کەم دەتوانین دەست بەسەر ژێنێتیکەکاندا بگرین، واتە کورپەلەیەك بێتە دونیاوە کە نێر و مێیەکی ئێمە دیاری بکەین، یان چاوی فلاَن ڕەنگە بێت، یان قەدی ئەوەندە بێت، یاخود بیری تیژ بێت." Human enhancement" کە ئەمرۆکە گفتوگۆی لەسەر دەکرێ و هەندێك لە فیلسوفانی ئاکار (ئەخلاق) لە دژی وەستاونەتەوە، بە شوێن ئەوەوەیە کە خۆمان بتوانین هەموو تایبەتمەندییەکانی کۆرپەلە هەڵ بژێرین، جا ئەوکات دایکان هەموویان پێیان خۆشە منداڵەکانیان لە ئانیشتایەن کەمتر نەبێ، لەبەرئەوەی سوود لە ژێنێتیك وەردەگرن بۆ ئەم مەبەستە. ببینە کاتێك کەسێك مێشکی بەم شتانە تێکەڵ دەبێ، کە وێنەکیشانی کۆرپەلە لە رەحمی دایك بە دەستی ئێمەیە، ئەو کەسە کێشەی بۆ دێتە پێش کاتێك

**لە قورئاندا دەیخوێنێتەوە "خودا شێوەی مرۆڤ لە رەحمی دایك دیاری دەكات. " یان لە رووداوە كۆمەڵایەتییەكان كاتێك گرانی یان هەرزانی پێش دێت یاخود كاتێ كشتوكاڵ كردن لە حاڵەتی پێشكەوتنە، كاتێ قاتوقوڕی ڕوو لە خەڵك دەكات. پێشینان ئەمانەیان دەدایە پاڵ خودا، دەیانگوت خودا قاتوقوڕی ناردووە، فەتارەتەی ناردووە، خودا خۆشگوزەرانی ناردووە، چونكە خەڵك پەرەستشیان كردووە و گوناحیان نەكردووە. وەكوو بۆتان ئاشكرایە ئەمرۆ ئەم شتانە جێگایەكیان نەماوەتەوە بۆ شیكار كردن، خەڵك ئیدی بەم جۆرە بیر ناكەنەوە، هەموان بە شوێن ئەوەوەن كە ڕەگ و ڕیشەی زانستی بۆ  ئەم روداوانە بدۆزنەوە؛ هەورەها چی بكەین كە ناچالاك"passive" نەبین و رۆڵمان هەبێ لە گۆڕانكاری رووداوەكان، و چلۆن خۆمان چالاك "active" بكەین؟**

**لەوانەیە ئەم ڕستە بەناوبانگەی "ماركس"ت بیستبێ كە دەیگوت: " تاكو ئێستا فیلسوفان جیهانیان تەفسیر كردووە، بەڵام ئێستا قسە لەسەر گۆڕانی جیهانە." واتە ئێمە هاتووین ئاڵوگۆڕ بخەینە جیهانەوە، چی دیكە بە وەسفی جیهان بەسەندە ناكەین. هەر دانیشین بڵێین كە جیهان ئاوا و ئاوایە، بەڵكۆ ئێمە هاتووین و نویلێكمان بەدەستەوە گرتووە بۆ جوڵان و گۆڕانی ڕووداوەكان. گرنگترین شوێنەكان بۆ گۆڕانكاری لە راستیدا لایەنی كۆمەڵایەتی و ئابووری بوو كە ماركس پەنجەی لەسەردانا. هۆكارە كۆمەڵایەتییەكان هۆكارەكانی مێژووی ئالوگۆڕەكانی كۆمەڵایەتی و ئابووری بەیان كرد، و دواتر هاوكێشەی دایە دەست و یاسای نیشان دا كە  بەم جۆرە رەفتار بكەن، هەڵبەت وادیارە لە كردەوەدا بیرۆكەكانی ماركس زۆر سەركەتوو نەبوو، بەڵام بەهەر حاڵ لەو دۆڵەدا بوو... تەنیا بەوەندە نەدەوەستا كە دانیشێ تا روداوەكان ڕووبدەن و دەیهەویست خۆشی رۆڵێك لە رووداوەكاندا بگێڕێ، ئەویش روداوەكانی جیهانی مرۆڤایەتی. تەكنەلۆژیاش سروشتێكی دووەمی وەدی هێناوە، شاعیرێك گوتبووی: "خودا  گوندەكانی دروست كرد خەڵكیش شارەكان."  ئێستا دەبێ بڵێین: "خودا سروشتی دروست كرد خەڵكیش تەكنەلۆژیا و تەكنەلۆژیاش سروشتێكی دیكەیە، واتە یاسایەكی دیكەی هەیە و جۆریكی دیكە خزمەتی ئێمە دەكات و ئێمە بە تەواوی پێوەی بەستراوینەتەوە و ژیانێكی تەواو جیاوازترمان هەیە، خودا دەزانێ كە ئەم تەكنەلۆژیایە لە داهاتوو چیمان لێ دەكات. "**

**لەم ئەخیرانە نووسەرێکی ئیسرایلی بە ناوی " یو وال نوح هراری" دوو کتێبی بە ناوبانگی نووسی بە ناوەکانی " مرۆڤی ژیر" و "مرۆڤ هاوچەشنی خودا" کە زۆر ترسمان وەبەردەنێ، دەڵێ: "ئاگادر بن 20 بۆ 30 ساڵی دیکە رۆباتەکان لەگەڵ ئێمە بەو جۆرە رەفتار دەکەن کە ئێمە ئەمرۆ لەگەڵ ئاژەلان ڕەفتار دەنوێنین؛ واتە دەبینە ژێردەستەی روباتەکان. ئەوان دەست بەسەر دونیادا دەگرن، "ئۆتۆماسیۆن" و "لۆگاریتم" دەست بەسەر هەموو شتێکدا دەگرێت. ئەوکات ئێمە تەنیا دەبینە تەماشاچی و هیچ کارەی جیهان، نەك هەر هیچمان بەدەست نابێ بەڵکو دەبینە ژێردەستە، واتە مرۆڤ خۆی دژی خۆی دروست کردووە. ئەم دژە کەم کەم ئەوەندە گەشە دەکات کە دروستکارەکەی خۆی دەکاتە ژێردەستەی خۆی و لە گۆڕەپان وەدەریدەنێ."**

**لە ئەفسانەکانی پێشوو خوێندومانەتەوە کە دەڵێن "جن گیرێك" هەبوو جنی دەگرت و دەیخستە ناو شوشە، بە شمشاڵ جنەکەی هێنایە دەرێ، بەلام نەیتوانی بیباتەوە ناو شوشەکە، ئیتر جنەکە هاتوو سواری ملی کابرا بوو، لەوەبەدواوە جن هەمیشە لە سەر ملی کابرای جن گیر بوو. وادیار، هەڵبەت کە هیوادارین وا نەبێ، پێشهاتێکی لەم جۆرە بۆ مرۆڤ لە پێشە و خەریکە روودەدا. وەك دەبینی بە روالەت ئایین لەم ڕوداوانەی تەکنەلۆژیا هیچ رۆلێکی نەبووە، مرۆڤەکان لە گۆڕەپانەکە بوونە و بە ئەقڵی خۆیان تا ئەو جێگایەی توانیویانە ملیان لێناوە و کەسیش پێشیان لێ ناگرێ و وەستانیان نییە. کەم کەم رۆخساری دونیایان گۆڕیوە و زیاتریش دەیگۆڕن و باوەڕیان وایە کە تەمەنی مرۆڤ و زەوی زۆر خێراتر لەوەی کە پێشتر پێشبینیان کردبوو، بەسەردەچێ. مەگەر ئەوەی کە ئەم پێشبینیانە وەڕاست نەگەڕێن.**

**چیرۆکەکە بەم جۆرەیە: سێ زانای گەورە، پێکهێنەری جیهانی لادینی ئەمرۆکەی ئێمەن کە هەموو ئێمە تێیدا دەژین، یەکەمیان "مارکس"ە، دووهەم "فرۆید" و سێهەم "داروین." ئەم سێ زانا گەورەیە بیری لادینی مرۆڤی ئەمرۆیان پێکهێناوە، فیلسوفانی دیکەی لادینی زۆرن، بەڵام لە روانگەی بەراوەردی بەندە و زۆرێکی دیکەش ئەم سێ کەسە کە دووانیان تەواو پەیوەستن بە سەدەی نۆزدەهەم و فرۆید پێیەکی لە سەدەی نۆزدەیەو پێیەکی دیکەشی لە سەدەی بیستە، ئەمانە بە راستی بیری مرۆڤەکانیان گۆڕی. مارکس وەکوو هەموومان دەزانین هیچ کات سەنگەری دژ بە دین نەگرت و لە بنەڕەتدا پێیی باش نەبوو کە مشتومڕ لەگەڵ ئاییندااران دروست بکات، بەلام**

**تیۆرییەکی خستە روو لەبارەی مێژووەوە کە مێژووی لە جێگای خودا دانا، کە مێژوو هەموو کارێك دەکات، هەموو کارێك لە دەستی ئەودایە. داروینیش هیچ کات سەنگەری لە دژی ئایین نەگرت هەتا دواتریش دەیانگوت خۆشی ئیماندار بووە، هەڵبەت زۆر گرنگ نییە کە خۆی ئیماندار بووە یان نا، بەڵکو گرنگ بیر و کتێبەکان و بەرهەمەکانیەتی، بەلام داروین "کات"ی لە جێگای خودا دانا، من کە لێرە باسی داروینیزمم دەکرد، ئاماژەم بەو خاڵە دا کە گوتم: "داروین دەیگوت کاتم بدەنێ من هەموو شتێکتان دەدەمێ. هەموو ئەم بوونەوەر ڕێك وپێکانە کە ئەمرۆ دەیبینن و پێتان وایە کە دروستکارێکی هەیە، لەبەرئەوەیە ئێوە پێتان وایە کە ئەمانە هەمووی لەپرڕا و بەیەکجار دروست بوونە، بەلام ئەگەر ئێوە بیربکەنەوە کە کاتێکی زۆر درێژ خایەنی پێچووە کە بە ملیۆنان ساڵ تێپەربووە، و ئەمانە وردە وردە و کەم کەم گۆرانکارییان بەسەر هاتووە تا گەیشتونەتە ئەم حاڵەتی ئێستایان، ئەو کات ئەوە قەبوڵ دەکەن کە ئەم جیهان پێویستی بە خودا نییە. و ئەو باسانەی کە ئایینەکان لە بارەی وەدیهاتنی جیهان و گیانلەبەران خستویانەتە روو، ڕوانگەیەکی پەسەند کراو نییە." فرۆیدیش ناهۆشیار "لاشعور"ی ئێمەی لە جیاتی خودا دانا، دەیگوت: "زۆرێك لە رەفتارەکانی ئێوە کەسێکی دیکە تەگبیری بۆ دەکات، ئەو کەسەش لە دەرەوەی خۆتان نییە، بەڵکۆ خۆتی، بەلام لە دەرونی خۆتان بوونتان هەیە و نازانی چیتان بەسەردێنێ و چی لێتان دەوێ و بۆ کام لا راپێچتان دەکات، یان چ فەرمانێك دەدات و چۆن فەرمانرەوایتان بەسەرەوە دەکات."**

**بەڵێ ئەمانە سێ کەس بوون کە لە راستیدا بزوتنەوەیەکی گەورەیان لە بیری مرۆڤەکاندا وەدیهێنا، کەم و زۆر هەر کەس وانە دەخوێنێ روانگەو بیرۆکەکانی ئەمانە دەخوێنێتەوە. راستە مارکسیزم لە کۆمەڵگا تا رادەیەك وەلانراوە، بەلام لە زەمینەی وانەکانی زانکۆ وەلانەنراوە، بەڵکو تۆ وەك کەسێکی خوێندکار بەتایبەت لە زانستی ئابووری یان مێژووی و کۆمەلایەتی ناچاری کە بیرۆکەکانی مارکس بخوێنییەوە، هەم بیرۆکەکانی خۆی هەم ئەو رەخنانەش کە لە سەری نوسراون. داروین زۆر جێگای خۆی پتەو کردووە بە تایبەت ئەم "ئاتێیستانەی" ئەخیر لە ئەمریکا زۆر پشتی پێ دەبەستن کە بە جۆرێك بیروکەکانی ئەو دەخەنە روو، پێیان وایە لە هەموو بوارێك قسەی کۆتایی کردووە کە لە دوای ئەو هیچی دیکە نییە. من لەبیرمە کە زاناکانی خۆمان کتێبێکیان دەنووسی لە کۆتاییدا دەیانوسی: " لەمە زیاتر ناکرێ چی دیکە بگوترێ. " ئەمانەش رێك خووی زاناکانی خۆمانیان هەیە، بە "ما لا مزیده علیه" قسە دەکەن. و پێیان وایە کە ئەمە قسەی کۆتاییە و هەتا گاڵتە بە خەڵکانی دیکە دەکەن،**

**بە دواکەتوو ناویان دەبەن کە زانستیانە بیر ناکەنەوە و هێشتا بیر لە ئایین و خودا دەکەنەوە. من ئەمانە دەڵێم هەڵبەت نابێ کەسانی دینداری وەکوو ئێوە نیگەران و نائومێد بکات، بەڵکو هەر لەم وڵاتانەی رۆژئاوا لە ئەمریکا یان کانادا فیسلوفانی زۆر گەورە هەن کە باوەریان بە خودا هەیە و لەگەڵ ئەوەی کە زانیاری زانستی باشیان هەیە، ئەمانە بیری ئەم خودانەناسانەیان پێ پەسەند نییە، و لە رەددانەوەی ئەواندا کتێبیان نووسیوە و کۆنگرەیان بەستووە و وتاریان داوە.**

**وتەکانی ئەم دەستەیە کەبە روالەت زانستیانە و "ناچرالیست"ن وادیار رەونەقێکی زیاتریان هەیە و مشتریان زۆرترە، دەتوانی چاوێك لە کتێبەکەی "داوکینز " بکەی لە ماوەیەکی کەم لە پڕفرۆشترین کتیبەکانی ئەورووپا و ئەمریکا و کانەدا بوو. نزیکەی چەند ملیۆن بەرگی لێ فرۆشرا، هەڵبەت ئەم نووسەرە زۆر زیرەکانە شتەکان دەنوسی و زیرەکانە بابەتەکان باس دەکات و خودی بابەتەکەش شیرین دەکات، بەجۆریك داروینزمی بەیان کردوە کە لەدڵی خەڵکی بنیشێ. خەڵکیش کتێبەکە دەکڕن و دەیخوێنەوە باوەری پێ دەکەن. وەکوو گوتم کەم کەم ژێر پێی ئایین لەق دەکەن. هەڵبەت ئەمە وەکوو پێشەکییەك بوو باسم کرد بۆ ئەوەی بزانین کە ئێمە لە چی جیهانێکدا ژیان بەسەر دەبەین و چۆن گەیشتووینەتە ئێرە. من هەوڵ دەدەم هەندێکی دیکەش کورتە مێژویی ئەم چیرۆکە باس بکەم تا ئەوەی دێینە ناو شیکاری بابەتەکە.**

**هەمووتان تا رادەیەك ئاشنان بە روداوەکە، گالیلەیەك هەبوو کۆپەرنیکێك هەبوو و داروین هەبوو. زۆربەی ئەمانە لەگەڵ کەلیسا تێك گیران، بەڵام نیوتن لە گەڵ کەلیسا مشتومڕی نەبوو، هەڵبەت نیوتن و دیکارت دوای گالیلە و کۆپەرنیك هاتن. دەکرێ بڵێین کە کەلیسا شەڕەکانی خۆی کردبوو و ئەرکی زانست و کەلیسای دیاری کردبوو، کە شوێنی ئێوە کوێیە و شوێنی ئێمە کوییە. من هەمیشە ئەوەم گوتووە کە شەڕی زانست و ئایین شەڕێکی زۆر پڕ بەرکەت بووە و دەبێ نرخی ئەمە بزانین. هەتا ئەمرۆکەش کە هەیە هەرگیز نابی وا بیربکەینەوە کە روداوێکی شەڕ و شومە کە لە جەرەیان دایە. مرۆڤ هەمیشە دەتوانێ لە ڕێگەی ئەم مشتومڕانەوە شتەکان لەروانگەیەکی دیکەوە ببینێ و سوودیان لێ وەرگرێ. دوو بوونەوەری خۆبەزلزان یەکیان زانست و ئەوی تریشیان ئایین، لە سەرەتاکانی سەردەمی ڕێنسانس و ڕووناکبیری ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە، هەردووکیان خۆبەزلزان بوون و**

هەردووکیان بانگەشەی کامڵ بوونیان دەکرد و بانگەشەی فەتحی جیهانی مەعریفییان دەکرد. ئەمانە سەریان لەیەکدا و سەری هەردوکیشیان شکا، ئەم سەر شکانەش بەسوودی هەردووکیان بوو، دانیشتن و نەشتەرگەرییان کرد و باندپێچیان کرد، ئەم هەوای خۆ بەزلزانییەیان لێ جیا بووەوە و بە شێوەی خاکی خۆیان نواند، واتە تا ئەمڕۆکەش زانستێکی خاکی لە تەنیشت ئایینێکی خاکی دانیشتووە، ئەمەش بە سوودی مرڤایەتی بوو. گەرچی جاروبار ئەم هاوسەنگییە تێك دەچێ و تێك چووە، واتە یەکیان هەڵدەستێ و دەیهەوێ ئەوی دیکە بخات ژێر پێی خۆی، بەتەواوی لە گۆڕەپان وەدەری نێت. هەر ئەو " لیۆئیشتراز "ەی کە باسم کرد کەسێکی تەواو سێکۆلار و لاییکە و پێشینەیەکی یەهودییەتی هەیە. بە ئاشکرا دەڵێ: "ئێمە ئایینمان پێویستە بۆ ئەوەی لەگەڵی بجەنگین و ئێمەش لەم جەنگە بەهێزتر دەبین، باش نییە ئەم رکابەرە بە تەواوەتی لە گۆڕەپانەکە بچێتە درێ. ئەوکات ئێمە کێمان هەیە کە لەگەڵی بجەنگین و هێزبگرین و ببینە پاڵەوانی جەنگ. " راستیش دەکات.

ببینە ئایین خۆگونجاندنێکی سەیری هەیە، لەگەڵ ئەو هەموو هێرشانە کراوەتە سەر ئایین و دەکرێتە سەری، لەم ئەوروپایە بۆ ماوەی دوو سەدە وا بیریان دەکردەوە کە ئایین بە تەواوەتی وەدەربنرێ و زەویەکە هەموو بخرێتە ژێر دەستی زانست، بەڵام ئەم رووداوە رووی نەدا و مایەوە، چونکە ئایین هەندێ توخمی خۆگونجاندن لە زاتیدا هەیە. هەندێك دەڵێن کە زانست هێشتا گورزی کۆتایی نەوەشاندووە ئەگەر بیوەشێنی ئایین لەناو دەچێ. من ناتوانم پیش بینی بکەم و فالگیریش نیم، بەڵام زۆرێك لەو پێشبینییانەی کە لەم جۆرە بیرۆکانەیان هەبووە، وەڕاست نەگەراون. وەکوو گوتم بە سوودی مرڤایەتی بووە کە ئەم دووانە هەردووکیان ماونەتەوە، و نابێ تەنیا شەڕ و مشتومری نێوان ئەم دووانە ببینرێ، چونکە هاوکاری لە نێوان ئەم دووانە هەمیشە هەبووە و هەیە و ئەم هاوکارییەش زۆر بەنرخە. کاتێك ئێمە دەڵێین زانست لەگەڵ ئایین دەرگیر بووە، بەپلەی یەکەم کاتێ لە روانگەی مێژوو تەماشای دەکەین، مشتومڕەکە لەگەڵ "کتێبی پیرۆز" بووە، بە تایبەتی "تەورات " کە هەندێ ئایەتی تێدا بوو لە سفری "وەدیهاتن"، کە باسی دروست بوونی زەوی، ئاسمان، خۆر، درەیا و چیاکان ..هتد دەکات، کە ئەمانە لەگەڵ پێشکەوتنەکانی زانستی ناکۆك بوون.

**کۆپەرنیك هات و گوتی کە زەوی چەقی جیهان نییە و هەموو شتێك بەدەوری زەوی و بەدەوری مرۆڤەکاندا ناسۆڕێتەوە، بەلکو بابەتەکە بە جۆرێکی دیکەیە. ئەمە هەوەڵین گورزی بەهێز بوو، و ئەمە لای زانست و زانایان پەسەندکراو نەبوو. کۆپەرنیك کتێبەکەی چاپ کرا، بەڵام کاتێ لەسەرە مەرگ بوو هەوەڵین بەرگی چاپ کراوی کتێبەکەی گەیشتە دەستی وخۆی زیندوو نەبوو کە شەڕ و مشتومرەکانی دواتری کەلیسا ببینێ. کتێبەکەی کۆپەرنیك 400 بەرگی لێ چاپ کرا. تا چەند ساڵ لەمەوبەر کە لە وتاری یەکێك لە زانایانی "مێژووی زانست" بووم، دەیگوت: " ئێمە تا ئەمرۆ 200 بەرگی کتێبەکەی ئەومان لە کتیبخانەکان دۆزیەوتەوە" وا دیارە کەلیسا هەوڵی لەناوبردنی ئەو بەرگانەی نەداوە. کتێبەکەی هەم لە کتێبخانە ئەهلییەکان هەم لە کتێبخانە گشتییەکانیش ماوەتەوە، لەوانەیە ئەو 200 بەرگەی دیکەش دەستبکەون.**

**تێگەیشتن لە کتێبەکە زۆر سەختە، هەتا لێ تێگەیشتنی بۆ زانایانی فیزیایی ئەمڕۆش زۆر دژوارە، بەڵام کاریگەری خۆی هەبووە. کەلیسا رووبەڕووی کۆپەرنیك بووەوە و پێشەکیەکیان بۆ کتێبەکەی کۆپەرنیك نووسی کە لەو پێشەکییەدا چەند خاڵێکی زۆر گرنگی تێدایە، ئەم خاڵانەش بەردەوام زانایانی مێژووی زانست و ئایین گێراویانەتەوە، کەلیسا بەمەرجی نوسینی ئەو پیشەکیە ڕێگەیدا کتێبەکە چاپ بکرێ. ئەو پێشەکییە زۆر دانایانە نووسراوە، کەلسیا بە زۆرەملێی نەهاتە ناو باسەکە. قەشەیەك بە ناوی "ئۆسیاندر" پێشەکییەکی نووسی، کە دەڵێ: " ئێمە لەگەڵ جەنابی کۆپەرنییەك هیچ کێشە و مشتومرێکمان نییە. ئەگەر ئەو بڵێ ئەوەی لە کتێبەکەی خۆیدا هێناویەتی گریمانەیە "فەرزیەیە" یان تیۆرییە. ئەوا هیچی دیکەمان لێی ناوێ، تەنیا نەڵێ من ڕاستییەکەم دۆزیوەتەوە کە ڕاستییەکی هەمیشەیە، بەڵکو تەنیا بڵێ من تیۆرییەکم هێناوە." ئەمە خالی یەکەم بوو کە خاڵێکی گرنگ و زیرەکانە بوو. لە راستیدا دواتر دەرکەوت کە زانست هیچ مافێکی دیکەی جگە لەوەی بانگەشەی تیوریی بوون بکات، نییە، بەڵام ئەو رۆژگارە رۆژگاری حەتمی بوون (یەقین) بوو، هەم کەلیسا بانگەشەی خاترجەم بوونی دەکرد هەم زانستیش. خاڵی دووەم ئەوە بوو کە "ئەگەر رۆژگارێك سەلمێندرا ئەوەی کە جەنابی کۆپەرنیك نووسیویەتی راستە کە خۆر چەقە و زەوی بە دەوریدا دەسوڕێتەوە، ئەوکات ئێمە وەك "کەلیسا" وەکوو روحانیانی کەلیسا رایدەگەیەنین کە ئێمە بە هەڵە لە هەندێك بەشی کتێبی پیرۆز گەیشتوین و بە دروستی دەرککمان نەکردووە." ئەمە یەکێکە لە هەستیارترین خاڵەکان کە لەو پێشەکییەدا نوسراوتەوە. نەیگوت کە کتێبی پیرۆز**

ڕەد دەکرێتەوە، بەڵکو گوتی دەکرێ تەفسیری بۆ بکرێ. تا ئەمرۆکە یەك تەفسیر باڵادەست بووە، بەڵام ئەگەر دیارکەوت کۆپەرنیك قسەکەی دروستە، ئەوا ئێمە گومان لە تێگەیشتنی خۆمان دەکەین بۆ کتێبی پیرۆز و دەیگۆڕین. بابەتی تەفسیر "interpretation and hermeneutics" هاتە گۆڕێ.

دوو بابەت لێرەدا سەریانهەڵدا: یەکەمیان "تیۆری بوونی زانست" و دووهەمیان "تەفسیری بوونی ئایین". ئەم دووانەی وتم زۆر زۆر زیرەکانە و دانایانەیە، و نیشانی دەدا کە کەلیسا یەکێك لە باشترین مێشکەکانی خۆی خستۆتە کار تا لەگەڵ ئەم پێشهاتە نوێ و گرنگە لە مێژووی کەلیسا دا ڕووبەڕوو بێتەوە. تا ئەمرۆکەش کە ئێمە لێرە دانیشتوین و قسە لەم بابەتە دەکەین وتەی فیلسوفانی زانست و فیلسوفانی ئایین بەدەر نییە لەم دوو دەربڕینەی باسمان کرد. زانست دەستەیەك تیۆریی سەلمادن (مدلل)ە یان بەڵگە هێنانەوەیە، نەك تیۆری هەمیشەیی و یەکجارەکی. ئایینیش دەستەیەك تەفسیری کاتییە، نەك تەفسیری هەمیشەی و قەتعی، ئەوەندە و تەواو.

کاتێك ئێمە دەڵێین زانست و ئایین، دەگەین بە مەعریفەتی زانستی و مەعریفەتی ئایینی. واتە ووشەی ئایین بگۆڕە بۆ مەعریفەتی ئایینی و وشەی زانستیش بگۆڕە بۆ گریمانەکانی زانستی یان مەعریفەتی زانستی. بەمەرجێك بەباشی لەم دوو مەعریفەتانە ئاگاداربی، ئەوکات ڕوالەتی بابەتەکە کە تا ئێستا دەمگوت زانست و ئایین، پەیوەندی ئەمانە لەگەڵ یەکتر بەم شێوازە ڕاست دەبێتەوە، بەڵام زۆر کەس ڕێگەیەکی درێژییان بڕیەوە تا گەیشتونەتە ئەم دەربڕینە ئەوەی کە زانست واتە مەعریفەتی زانستی و ئایین واتە مەعریفەتی ئایینی. ئێمە ئایینی تەفسیرنەکراومان نییە بە هەمان شێوە ئەوەی کە لە بارەی سروشتەوە هەمانە گریمانەیە، ئێمە یاسایەکی سەلمێنراوی زانستیمان نییە، بەڵام هەڵبەت تیۆری سەلماندن یان بەڵگەهێنانەوە (مدلل)مان هەیە واتە بەڵگەو شایەتی باشمان لەسەریان هەیە و هەروا لە خۆڕا ئەو تیۆریانەمان نەهێشتونەتەوە، بەڵکو بەڵگەیان لەسەر هەیە، لەبەرامبەریشدا تەفسیرەکانیش نوێخوازن، لەبەرئەوە قسەی ئەو قەشەیەتان لە بیر بێت.

یەکێك لە زانایانی فەلسەفەی زانست کەخەڵکی فەرانسە بوو، لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم دەژیا، کتێبێکی نووسی کە لەوێدا ڕەخنە لە گالیلە و کۆپەرنیك دەگرێ، ئەم فیلسوفە خۆی مەسیحی و ئیماندار بوو، دەڵێ ئێوە

لە خۆڕا دەڵێن بیرۆکەی هەمیشەی و یەکجاریتان هێناوە، بەڵکو دەبوایە ئێوە لە سەرتاوە گوتباتان تیۆریمان هێناوە. بەجۆریك کە دواتر تیۆرییەکەی کۆپەرنیك شیکاری بۆکرا و لیکۆلینەوەی لەسەر کرا، کە من کتبێیکم تەرجەمە کردووە بە ناوی "مبادی مابعدالطبیعه علوم نوین" کە نووسەرەکەی فیلسوفێکی ئەمرکییە بە ناوی "ئارتۆر بێرت" زۆر کتیبی گرنگە، ئەو لەوێدا دەڵێ: "کاتێك دواتر زاناکان ئەندێشەکانی کۆپەرنیکیان خستە ژێر لێکۆڵینەوە، بینیان کە بەڵگەکانی ئەو بۆ سەلماندنی "ناوەند بوونی خۆر" و بەڵگەکانی "سوڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆر" کافی نییە. دواتر دەرکەوت کە قسەکەی ئەو زانایە گرنگ بووە، بەلام ئەگەر ئێمە بوینایە و کۆپەرنیك و بەڵگەکانی، ئەوا مافی خۆمان بوو کە قسەکەی پەسەند نەکەین. کەلیسا مافی خۆی بوو کە پەسەندی نەکات، ئەوەی کە دواتر هاتن و گوتیان کەلیسا زۆر دژ بە زانست بووە و ڕەش بین بووە، راسیتەکەی ئەمانە بانگەشەی ناڕاستن، هەڵبەت من پشتگیری لە کەلیسا ناکەم، کەلیسا کاری زۆر ناڕەوای ئەنجام داوە، بەڵام کاتێك مێژوو دەخوینیەوە دەبێ بە وردی بیخوێنیەوە. هەروەك مێژوونوسانی زاست دەڵێن: داوەری کردن لە سەر مێژوو بە هۆی داتاکانی ئەمرۆ هەڵەیە، ئەگەر ئێستا ئەم تیۆریەی "خۆر ناوەند"ییە پەسەند کراوە، ناکرێ بڵێین کەوابوو کۆپەرنیك راستی دەگوت، بەڵکو دەبێ کۆپەرنیك و گالیلە بە هۆی داتاکانی خۆیان بپێوین. دەبێ ببینین لەسەر ئەو داتایانەی کە هەیبوو مافی ئەوەی هەبوو بانگەشەی ئەو تیورییە بکات یان نا. کتێبێك هەیە کە "کۆستلێر" نوسیویەتی بە ناوی" sleep walker" یان " بەدەم خەو ڕۆشتوەکان" زۆر کتیبیکی گرنگە، هەم چیرۆکە هەم مێژووی زانستیشە. "بە دەم خەو ڕۆیشتوو" واتە کەسانێك کە لە خەودا دەڕۆیشتن. پاڵەوانانی ئەم کتێبە سێ کەسن: نیوتن، گالیلە و کۆپەرنیك. دەڵێ ئەوانە لە خەودا دەڕویشتن و لە بێداریدا نەبوون، واتە هەندێك شتیان دەگوت هاوشیوەی ئەوانەیە کە خەڵکانی خەوتوو دەیلێن، بە چاوی کراوەوە نەدەجولان. دواتر تیۆریەکانی ئەمانە قەناعەتیان پێکرا و راست کرانەوە و پتەوکران و پەسەند کران. ئەگەر بە داتاکانی سەردەمی خۆیان بیانپێوین، تێۆرییەکان زۆر پتەو نەبوون، هەروەکو گالیلە کە لە سەر تیۆری هەلکیش و داکیش "جزر ومد" قسەکەی هەڵە دەرچوو.

گالیلە کەسێك بوو کە زەوقێکی سەربەگێچەڵی هەبوو، خولقیشی توند بوو. لە نامەکانی بۆ کچەکەی نووسیوە کە چاپ کراوە دەبینین کە کەسێك بوو خولقی توند بووە، هەر بەو جۆرەش لەگەڵ کەلیسا تێکگیرا. کەلیسا هەر

واشی بەو دەگوت کە نەڵێ تێۆرییەکی هەمیشەیی هێناوە. کاتێك چاو  لە مێژوو دەکەین ئەم مشتومڕە  بە کتێبی پیرۆز دەستی پێکرد و بە رواڵەت ناکۆکی هەبوو لە نێوانیان و بابەتی خودا هێشتا نەهاتبووە ناو باسەکە. ئێمە لە سەردەمی رینسانس هیچ زانایەك نابینین کە نکۆلی لە بوونی خودا بکات و لەسەر کاریگەری نکۆڵی خودا لەگەل کەلیسا مشتومڕ بکات. ئەم رووداوە لە سەدەی نۆزەدەهەم لەگەڵ بیرۆدوزەکەی داروین سەریهەڵدا. لەسەردەمی رینسانس مشتومڕەکە لە سەر بابەتی سروشت بوو، لەسەر ئەو بابەتانە بوو کە زانست دەیهەویست پەردەیان لەسەر لادا. وەکوو پەیدابوونی ئەستێرە، دەریا وچیاکان، هەروەکو کارەکانی "جۆرج لایل"بەر لە داروین.  داروین لە زۆر لە قسەکانی پشتی بە بیرۆکەکانی ئەو دەبەست. ئەو کەسێکی زەویناس بوو، لێکۆڵینەوەی لەسەر دەرکەوتنی چیاکان و دەریاکان کردبوو. هەروەك دەزانن لە تەورات هاتووە کە دەڵێ خودا لە شەش روژ جیهانی وەدیهێناوە، رۆژی یەکەم دەریاکان و رۆژی دووەم خۆر و دواتر چیاکان و ...هتد. ئەمان دەیانگوت: نەخێر، چیاکان بەیەك رۆژ دروست نەبوونە، بەلکو کاتێکی زۆری خایاندووە تا چیایەك وەدیهاتووە تا ئەوەی دەریایەك شکل بگرێ، و لەبەر ئەوە بە ئاشکرا دژایەتیان لەگەڵ کتێبی پیرۆز دەکرد، هەڵبەت کەلیساش هەمیشە دەیگوت ئەگەر ئەم تیۆریانە سەلمێنران، ئەوا ئەو کات ئێمە ڕایدەگەیەنین کە تا ئێستا بە هەڵە لە بەشێك لە کتێبی پیرۆز گەیشتوین.

لێرەدا شتێکی دیکە دێتە پێشەوە، دەکرێ جاریك، دووجار یان سێ جار ئەم قسەیە دووبارە بکەنەوە کە بەدروستی لە کتێبی پیرۆز نەگەیشتوون، بەڵام ئەگەر ئەم جیاوازیانە هەر ڕووی لە زیادبوون کرد ئەو کات چی؟  ئایا دەکرێ هەمیشە پاشەکشە بکەن و بڵێن کە تا ئیستا بەهەڵە لەبەشێك لە کتیبی پیرۆز گەیشتوین؟ ئەی باشە لەوێ دانیشتبوویی و موچەت لە کەلیسا وەرگرتووە بۆ ئەوەی چی بکەی؟ بۆ ئەوەی بە هەڵە لێی تێ بگەی؟ دەی ئەگەر وایە دەستی لێ هەڵگرەوە دەرگای ئەم دوکانەت داخە باشترە!

ئەمە بوو کە کەم کەم ئەم لۆژیکە لاواز بوو. لە عەسڵدا شتێکی باش بوو، بەلام کاتێك یەکجار یان دووجار یان سێ جار بێت، بەڵام کە هەمیشە دووبارە بێتەوە ئەوکات هەست دەکەی کە رووبەڕووی شتێك دەبیتەوە کە هەمیشە پاساو دەهێنێتەوە، کە دەیهەوی پینەوپەڕۆ بکات. جل و بەرگێك چەند جارێك پینەی دەکەی دواتر فڕێی دەدەی، ئەوەندە ناهێنێ ئەو هەمووە پینەیەی لێ بدەی. من هەندێ جار کەسانێك دەبینم بەرامبەر قورئان هەمان کار

دەکەن و هیچ سرنجی ئەم مێژووەی پێش خۆیان نەداوە، ڕێك ئەمەم بیردەخاتەوە، کە هەمان تەلاش لە لایەن موسلمانەکانەوە کراوە، پێیان وایە لەبەر ئەوەی موسڵمانن و باوەڕیان بە خودا هەیە کەواتە کارەکەیان ڕاستە، بیر لەوە ناکەنەوە کە ئەوانی دیکەش واتە کەلیساش باوەری بە کتێبی پیرۆز هەبووە و بە کەلامی خوایان دەزانی و بە وەحی لە قەڵەمیان دەدا، بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودا ئەم کارەیان دەکرد.

گالیلە لە بەرهەمەکانی خویدا باسی شتێکی گرینگ دەکات و وتەیەکی جوانی هەیە، دەڵێ: "خودای سروشت و خودای شەریعەت یەکێکە، هەمان خودای کە سروشتی دروست کردووە هەمان خودایە کە شەریعەتی ناردووە و لەبەر ئەوە ئەمانە ناتوانن ناسازگار بن، یەك خالق و یەك بەدیهێنەرن واتە یەك نوسەری هەبووە." هەڵبەت لە ڕوانگەی ئەو مەبەستی مەسیحیەتە، بەڵام ڕێگە چارەی گالیلە بۆ ئەم بابەتە کە دەیخاتە ڕوو ئەوە نەبوو کە بڵێ ئەوەی ئێمە دەیڵێین "گریمانەیە"، ئەو شتێکی گرنگی لەم باریەوە دەگوت. وەکو دەزانن لە زمانی ئینگلیزیدا وشەی"heavn"هەم بە مانای ئاسمان دێ و هەم بە مانای بەهەشتیش. دەیگوت ئایین هاتووە بە مرۆڤەکان بڵێ چۆن بچن بۆ بەهەشت نەك ئەوەی کە ئاسمان"heavn"چۆن کار دەکات، یانی لەبارەی جوڵەی ئەستێرەکانەوە قسە بکات، بەڵکو دەڵێ مرۆڤەکان چۆن بڕۆن بۆ بەهەشت.

گالیلە بەم وتەیەی هێڵێکی جیاکەرەوەی لەم نیوانەدا دروست کرد. ئەو بە کەلیسای دەگوت وا لە خەڵك مەکەن کە چاوەرانی هەموو شتێك لە ئایین بکەن، لەوانە زانستی ئەستیرە ناسی و شتی دیکە، یانی ئەوەی پێیان بڵێن هەموو شتێك لە کتیبی پیرۆزدا بەدەست بێنن. لەبنەڕەتدا ئەمە قەسدی پێغەمبەران نەبووە کە بێن و زانستی هەڵسوڕانی ئاسمانەکان و هەسارەکانمان پێ بڵێن، بەڵکو چۆنیەتی چوونە بەهەشتمان فێردەکەن. لەبەرئەوەی پێشینان پێیان وابوو بەهشت لە ئاسمانەکانە لەبەر هەندێ ئاسمان مانای خودی ئاسمان و بەهەشتیش دەگرێتەوە. هەڵبەت زۆریش لە موسلمانەکان پێیان وایە بەهەشت لە ئاسمانەکانە. ئەم وتەیەی گالیلە هێشتاش ئەندێشەیەکی زیندووە، من لە بەرهەمەکانی خۆم زۆرم ئاماژە بەم خاڵە کردووە، و پشتم پێ بەستووە، کە هەتا ئێمە بازنەی چاوەڕوانییەکانی خۆمان لە ئایین دیاری نەکەین، سەرکوتوو نابێ لە چارەسەری کردنی مشتومڕی بابەتی زانست و ئایین.

**ئەگەر لە گالیلە بێینە خوارتر، دەگەینە نیوتن. نیوتن زۆر کێشەی نەبوو، مرۆڤیکی ژیریش بوو و لەگەڵ کەلیسا مشتومڕی نەدەکرد و دیکارتیش بە هەمان شێوە. هەڵبەت ڕوانگە و بیرۆکەکانی دیکارت لەگەڵ کەلیسا یەکی نەدەگرتەوە، بەڵام خۆی توش نەکرد، چونکە سەرەنجامی زاناکانی پێش خۆیان دەزانی و بێ دەنگیان هەڵبژارد وتەکانیان کەمێ بە لێڵی دەهێشتەوە. بێینە خوارتر و بگەینەوە داروین کە لەسەرووی هەموویانەوەیە لە تیهەڵچونی لەگەل کەلیسا و دەرکەوتنی مشتومڕی زانست و ئایین. وەك لێتان ڕونە تیۆرییەکی داروین زۆر سادەیە، بەڵام ئەو هەمووە قسەو باسەی لەسەر کراوە، تەفسیرێکی زۆر لە خۆهەڵدەگرێ. هەمیشە داروین خۆی دەیگوت: "ڕاستە کە تیۆرییەکەی من نەسەلمێنراوە، بەڵام ناکرێ تیورییەك ئەو هەمووە توانایەی هەیە لە ئاشکرا کردن و دەرخستنی شتەکان، تیۆرییەکی پوچەڵ بێت. من بەم تیۆرییەم دەتوانم زۆر شت تەفسیر بکەم. لەبەر هەندێ دەبێ بەشێك لە حەقیقەتی لەخۆگرتبێ." ئەهلی کەلیسا لێرەدا زۆر زوو دەرکی ئەوەیان کرد، کە بابەتەکە تەنیا کتێبی پیرۆز نییە، بەڵکو بابەتەکە خودا بوو. لێرەدا بابەتی خودا هاتە پێشەوە. زانست و ئایین مشومڕەکانیان لە ئاستی کتێبی پیرۆز چووە سەرتر و بوو بە مشتومڕی نیوان خوداناسان و خودانەناسان.**

**داروین کە پێی دەلێن نیوتنی بایۆلۆژی، بە گوتەی یەکێك لە میژوونوسەکان نووسیبووی: " داروین بوونی خودای ڕەد نەکردەوە، بەڵام گوتی پێویستمان بە خودا نییە. " کە کەسانێکی زۆر ئەم قسەیە دووبارە دەکەنەوە. واتە ئێمە دەتوانین جیهانی گیانلەبەران بەجۆرێك باس بکەین بەهۆی یاساکانی سروشت و هەر بەو میکانزیمانەی داروین گوتویەتی کە بە جۆرێك پێویست بە دەستێوەردانی خودا نەکات. داروین بە بیری خۆی بەڵگەی ڕێکوپێکی یان "**برهان نظم**"ی پوچەڵ کردەوە، نالێم قەسدی ئەو ئەوبووە، دەرئەنجامی کارەکەی ئەوە بوو، بەڵام هەندێك پێیان وابوو کە ئەگەر " بەلگەی ڕێکوپێکی" بێ هێز بێت ئیتر ئێمە هیچ بەهانەیەکمان نابێ کە بمانهەوێ خودا بهێنیینە ناو بابەتەکەوە. داروین لە دوای کانت هات، ئەی کانت چی کرد؟ کانت گوتی: " ئەو ئەقڵەی خودا داویەتی بە مرۆڤەکان هێزی چوونە ناو بابەتی سەرو سروشت (**ماوراءالطبیعة**)ی نییە. لە بنەڕەتدا ئەقڵی ئێمەی بۆ ئەوە دروست نەکردووە، مرۆڤ **2000**ساڵ هەڵەی کرد لە ئەفلاتۆنەوە تا ئێستا، کە ئەو پرسیارانەی بەرامبەر خۆی دروست کردووە کە نەیتوانیوە وڵامەکانی بدۆزێتەوە. **2000** ساڵ درێژەی کێشاوە کە تێ گەیشتوم کە نابێ ئەو پرسیارانە بکرێت. ئەقڵی ئێمە توانای وەڵامی ئەو پرسیارانەی نییە. ئێمە دەبێ لە سنووری هەست و ئەزمونە**

زانستیەکانی خومان قسە بکەین. یەکێك لەو پرسیارانەی کە مرۆڤ کردوویەتی و هەرگیز نەیتوانیوە وڵامی بداتەوە، پرسیاری بابەتی خودایە. ئێمە ناتوانین خودا بسەلمێنین. لە بنچینەدا ئەقڵی مرۆڤ بۆ چارەسەرکردنی ئەو بابەتانە دروست نەبووە وەکوو "جبر و اختیار"و "نویی و کۆنی جیهان" ... هتد.

لەدوای کانت ئەم بەڵگەهێنانەوە تەقریبەن بە تەواوی لە فەزای مێتافیزیك باری کرد. چاو لە کتێبی "نوێ بوونەوەی فیکری دینی" "ئیقبال لاهوری" بکەن، دوو بەشی یەکەمی کتێبەکەی بۆ زیندوو کردنەوەی ئەو بەڵگانە و وەڵامدانەوەی کانتە، هەڵبەت ئەو دەزانێ ئەو ڕێگایەی کانت بێ گەڕانەوەیە، بەڵام هەوڵی داوە ڕێگایەك بخاتە ڕوو بۆ ناسینی خودا ئەویش لە سەر بنەمای زانستی نوێ. بەشێوەیەکی گشتی دەکرێ بڵێین زۆربەی فیلسوفانی دوای کانت گەیشتنە ئەو باوڕەی کە دەبێ مێتافیزیکی کۆن وەلابنێن. داروین ئاخرین بزماری لەم تابوتە دا. واتە گوتی بەڵگەی ڕێکو پێکی گەردون یان "برهان نظم" کە بە ڕواڵەت ڕوخسارێکی زانستیانەی هەیە، و لەسەر بنەمای ئەو ڕێکوپێکییە کە لە سروشتدا هەیە و دەیهەوێ خودایەکی هەنەرمەند یان خودایەکی"ناظم" بسەلمێنێ، کە ئەویش ناکرێ، لەبەرئەوە ئەم دەفتەرە ببەستن.

با بێن بزانین مشتومڕی نێوان "زانست و ئایین" یان "ئەقل و وەحی" یان "زانایی و بینایی" یان "ئەسینا و ئورشەلیم" چۆن دەستی پێکرد. لە ئایین و فەلسفە دەستی پێکرد و گەیشتە زانست و ئایین لە سەردەمی نوێ. سەرەتا ئەم مشتومڕە لە دەستکەوتە زانستیەکان یان مەعریفەتی زانستی و کتێبی پیرۆز بە تایبەت تەورات بوو و دواترخودا هاتە ناو بابەتەکە، وای بۆ دەچوون کە زانست ڕووبەڕووی خوداش بۆتەوە وخودا لە گۆڕەپانی مەعریفەتی مرۆڤایەتی دوورخراوەتەوە. سەدەی بیستەم لە ڕاسیتدا کاتێ دەستی پێکرد کە تەقریبەن خەڵکی ئەم بابەتەیان پەسەند دەکرد. واتە بیریان دەکردەوە کە ئەم هزرانە بە باشی شوێنی خۆیان کردۆتەوە. هەر لەبەرئەمە بوو کە زۆرێك لە کۆمەڵناسان ڕەباسیان لەوە دەکرد کە سەردەمی سیکۆلاریزەیشن بە جۆرێك دەستی پێکردووە کە ئیتر گەرانەوەی بو نییە. واتە ئازاد بوون لە ئایین، ئازاد بوون لە هزری خوداناسی. ئەوەی کە ئایین چی دیکە ناتوانێ ڕولێکی لە کۆمەڵگادا هەبێ. لە لایەکەوە فرۆید هێرشی هێنا، گوتی خوداناسی و خوداباوەری ڕیشەیەکی لاشعوری هەیە، کە جۆرێکە لە نەخۆشی لەمرۆڤەکاندا. لە لایەکی دیکەو مارکس هێرشی هێنا و گوتی خوداباوەڕی

**هۆکاری ئابووری هەیەو هەژارەکانی کۆمەڵگا کە داماو و کڵۆڵ بوونە، بۆ سەرکەوتنی خەیاڵی روو لە خودا دەکەن، و لە لایەیکی دیکەشەوە داروین گوتی ئەوانەی پشت بە بەڵگەی رێکوپێکی جیهان دەبەستن بۆ خوداناسی، ئەوانیش ژیر پێیان لەقە و لە سەر ئەستوونێکی پتەو ڕانەوەستاون. لە چەندین لاوە خەنجەر لە پەیکەری ئایین درا و خوێنی لێ دەچوڕا. سەدەی بیستەم، پەیکەرێکی خویناوی ئایینی بەخۆیەوە بینی کە لە هەموو لایەکەوە هەوڵیان دەدا بەرەو مەرگی ببەن. یان تاوانبار دەکران بە دژە زانست و دژە زانایی، یان تاوانبار دەکراو بە کەمایەسی فکری و نەخۆشی دەرونی، یان تاوانبار دەکران بە سەرنەکەوتن و ناکام مان لە رووی ئابوورییەوە. مارکس دەیگوت: "ئایین روحی جیهانی بێ روحە" جیهانی بی رۆحی کریکاران و ژێردەستان و ستەم لێکراوان. کە هیچ ڕێگایەکی دەربازبوون لەم جیهانە شك نابەن، رزگاربوونیان لە پەنا بردن بۆ خوا دەبیننەوە. خاوەن دەسەڵاتەکانیش سوود لەم دەرفەتە وەردەگرن. وەك دەبینن کە ئایین لە هەموو لایەکەوە گەمارۆدرا.**

**ئەمانەی کە باس کران بێ وەڵام نابن و کەم کەم دەست دەکەین بە وەڵام دانەوە و شیکاری ئەم بابەتانە، تا ئێرە زیاتر باسمان لە کورتە مێژوویەکی بابەتە کرد و چۆنیەتی پەیدا بوونی ئەم بارودۆخە. و تاکو ئێرەش سێ خاڵی گرنگمان لە قسەکانی گالیلە و کۆپەرنیك دەرهێنا کە زۆر جێگای بیر لێکردنەوەن: یەکیان ئەوەی کە زانست دەستەیەکە لە تیۆری و دووەمیش ئایین دەستەیەکە لە تەفسیرە، سێیەمیش ئەوەی کاتێك باس لە ئایین دەکەین دەبی چاوەڕوانیەکانمان لە ئایین دیاری بکەین یان سنورداری بکەین. زۆربەی مشتومرەکانی کە لەگەڵ ئایین روویداوە، لەگەڵ ئایینی زۆرترین ڕادە (ماکزیمۆم) بووە، واتە ئاینێك کە چاوەروانی زۆری لێ بکەی، سرنج لەم خاڵە بدەن زۆر گرنگە، چاوەڕوانی کردنی زۆر لە ئایین یان لە لایەن خەلکی ئاسایی (عەوام) بووە یان ڕێبەرانی ئایینی ئەم چاوەڕوانیانەیان وەدیهێناوە. دەیانگوت هەموو شتێك لە ئایین داوا بکەن، هەتا چارەسەر کردنی نەخۆشەکانتان. دەیانگوت بڕۆن بزانن فەرموودەیەك یان دۆعایەك لە فلان ئیمام یان لە فلان ئەولیا ببیننەوە کە چارەسەری کیشەکانتان بکات. هەر ئەو نەهامەتیانەی کە ئەمرۆ لە ئێران بەسەرمان دێت. ئەمە ئەو ئایینە "ماکزیماڵە"یە. یاخود دەڵێن پزیشکی، ئەستێرەناسی، فیزیا، مێژوو لە ئاییندا بدۆزنەوە. چاوەڕوانییەکی لەم جۆرە لە ئایین واتە خانوویەکی گەوەرە کە بتهەوێ لە دووری هەزاران مەتر تیری تێبگری، هیچ کات ئامانجەکەت بە هەڵە ناپێکی، بۆ هەر کوێی بهاوێژی پێی دەکەوێ، بەلام ئەگەر بمانهەوێ ئەم دینە کەمێ لاوازتر بکەین یانی**

**بچوکتری بکەینەوە و ئەویش نەك هەروا بە هەڕەمەکی، بەڵکو لەسەر بنەمای بەڵگە، لەسەر ئەو بنەمایەی کە لە بنەڕەتدا ئایین بۆچی هاتووە؟ و نابێ چ شتێکی لێ داوا بکەین؟ ئەوکاتە ئەو ئایینە بچوك دەبێتەوە، بەڵام چالاك دەبێ، ئەوکات ئەم ئایینە بچوك و چالاکە دەتوانێ لە بەرامبەر زۆریك لەو مشتومڕانە بە سەرکەوتویی بێتە دەرێ، و تەندروستیش دەبێ. ئەوکات ئەرکەکانی خۆشی بە باشی بەجێ دەهێنێ. یەك بونەوەری تەمبەڵ تەنیا دەخوا و دەکەوێ و دواتر دوچاری نەخۆشی جۆراوجۆر دەبێ و ناتوانێ لە جێگای خۆی بجوڵێ. دەبێ چالاکی کەیەوە، دەبێ بازنەی چالاکیەکانی بۆ دیاری بکەی. نابێ خۆبەزلزان بێ، مشتومری نێوان زانست و ئایین مشتومری نیوان دوو بونەوەری خۆبەزلزان بوو کە هەردووکیان دەبوایە سەریان شکابا تا خاکی بووبانەوە، کە خۆشبەختانە ئەوە رویدا. لە رۆژگاری ئێمە ئەم مەشتومرە کەمی زیادی کردووە و دەبی دووبارە بابەتەکان بناسینەوە و زەمینەکانمان دیاری بکەین، کە لەکۆتایدا بزانین حوکمی "فەلك گەردان" یانی حوکمی "فەلەکی گەردان."**

## بەشی دووەم

هەر وەکو لە بەشی یەکەم  باسمان لەوە کرد کە چۆن لە ئەوروپا و دونیای رۆژئاوادا کەم کەم زانست بە سەر فەلسفە و مێتافیزیکدا زاڵ بوو، هەروەها وەکوو رۆلگێڕی سەرەکی گۆڕەپانی مەعریفەت خۆی نیشاندا و دواتر لەگەڵ ئایین تێگیران. لە سەرەتادا بانگەشەی ئەوەی دەکرد یاخود وا خۆی نیشانی دەدا کە ئایین بە سوودی ئەو گۆڕەپانەکە چۆل دەکات، بەڵام لەگەڵ تێپەڕینی کات جۆرێك لە ئاگربەست لە نیوان ئەم دوو چەمکەدا روویدا، بەڵام دیسان لە سەردەمی ئێمەدا واتە لەسەدەی بیستویەك، زانست بە هۆی پێشڕەویی لە لقە جیاوازەکانی کە روویداوە بانگەشەی لە پێشتر بوون دەکات، و بە شێوەیەکی چالاك هاتۆتە ناو ئەم مشتومڕەوە و هەوڵ دەدات ناوچەی زیاتر بە سوودی خۆی داگیر بکات و ئەگەر بتوانێ پاشەکشەش بە ئایین بکات.

هەتا بەشێك لە کۆمەڵناسان پێشبینیان کردووە  کە لە سەردەمانی داهاتوو واتە لە سەدە بیست و دوو بەو لاوە دەبێتە سەردەمێکی بێ ئایینی. واتە مرۆڤەکان دەست لە ئایین دەکێشنەوە و لێی نائومێد دەبن. دەرمانی هەموو دەردەکان و وەڵامی هەموو پرسیارەکانیان لە ناو زانستی ئەزمونی و زانستی مرۆیدا دەدۆزنەوە و سەردەمی پێغەمبەران  بەسەردەچێ  و سەردەمی زانایان دەستپێدەکات و لەسەر کورسی مەعریفەت دادەنیشتن. ئەمە دیمەنێکە کە ماوەیەکە دەستی پێکردووە و ئێمە کەم تا زۆر تەقریبەن ئێستا لە فەزایەکی لەم جۆرەدا ژیان بەسەردەبەین.

باسم لەوە کرد کە چۆن بە هۆی هاتنی گالیلە و لە کۆتاییدا دەرکەوتنی سێ ڕۆلگێری سەرەکی کایەی لادینی، بارودۆخەکە سەرەوژێر بوو و ئایینیش ئەو تواناییەی پێشتری نەما و لاوازتر بوو. هەروەکوو کۆمەڵناسان پێشبینیان کرد جیابوونەوەی ئایین لە حکومەت و بگرە جیابوونەوەی لە زۆر بابەتی کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی، زانستی و مرۆیی روویدا. چەمکی ئایین زیاتر روویەکی تاکەکەسی بەخۆیەوە گرت و رۆڵە کۆمەڵایەتیەکەی لەدەستدا. پێشهاتێکی لەم جۆرە کەم تا زۆر ڕوویداوە، بەڵام بەشێك لە کۆمەڵناسەکان بە هۆی رووداوگەلێك کە لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم و بیستویەکەم پێشهات، واتە شەڕ و هەستانەوەی ئایین بەرامبەر ئەو لایانانەی کە

**لە کایەکانی سیاسەت و حکومەتدا بوون، پێداچوونەوەیان بۆ نووسینەکانی خۆیان کردەوە لە سەرئەو پێشبینیانەی کە پێشتر بۆ لە نێوچوونی ئایین کردبوویان. گوتیان کە ئایین دووبارە گەڕاوەتەوە بۆ گۆرەپانەکە. ئەم گەڕانەوەیەش بۆ گۆڕەپانەکە لە چل ساڵ لەمەو بەر بە هۆی سەرهەڵدانی شۆرشی ئیسلامی ئێران دەستی پێکرد و لە نووسینەکانی کۆمەڵناسان ئاماژەی پێکرا، و کەم کەم لەگەڵ پەیدا بوونی گروپە ئایینیەکانی دیکەی وەکوو ئەلقاعیدە و داعش و بزوتنەوە ئایینیەکانی دژ بە کۆمونیستی کە سەرەتا لە ئەورووپای ڕۆژهەلأت لە پۆلەندا، و بۆ یەکەم لە کەلیسا دەستی پێکرد، هەروەکوو سەرهەڵدانی بزوتنەوەی "پێنتاکۆستاڵ"یش لە ئەفریقا. هەموو ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی کە بڵێن دووبارە ئایین پێی خستۆتەوە گۆرەپانەکە و بانگەشەی ئەوە دەکات کە بوونی هەیە و هاتووە تا ڕۆڵگێڕ بێت. هەڵبەتە بە داخەوە ئەم دووبارە گەڕانەوەی ئایین بۆ گۆڕەپانەکە روخسارێکی معریفەتیی نەبوو، بەڵکو روخسارێکی سیاسی، سەربازی و حکومەتی هەبوو. تا ئێستا نەیانتوانیوە قناعەت بە ئەهلی مەعریفەت بکەن کە بە ئەمبارێکی دەوڵەمەندی پڕ لە مەعریفەتەوە گەڕاونەتەوە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان، بەڵام "ئایینی شوناس" بۆ گرتنە دەستی حکومەت و دەسەلأت گەڕاوەتەوە. ئەوەی کە لە داهاتوودا چی لێ دێتەوە لە دەستی کەسدا نییە و نازانین کە مێژوو چی لە هەنبانەدا هەیە و چی ڕوودەدا، بەڵام ئەوەی کە ئایین لە گۆرەپانەکە ماوتەوە، ڕوون و ئاشکرایە. هێشتا چرای مزگەوت و کەلیساکان ڕۆشنن، ئەنجومەنە ئایینیەکان لە هەموو شوێنێك بەردەوام و لەسەر پێن. کتێبانێکی زۆری ئایینی دەنوسرێن، زانکۆکان وانەگەلێگی زۆر لەمەڕ ئایین دەڵێنەوە، باوەرە ئایینیەکان لە ناو خەڵکدا هێشتا ڕۆڵ دەبینن. بۆ نموونە لە کاتی دەنگدان لەو ولأتانەی ئازادی مافی دەنگدان هەیە، ئایین لە بڕیاری دەنگدانیان رۆڵ دەبینێ، لەوەی کە دەنگ بە کێ بدەن. کەوابوو بە شێوەیەکی جیددی ئامادەبوونی هەیە. گەرچی وەك پێشتر نییە و هەرگیز ناتوانێ وەك پێشتریش بێت، لەبەرئەوەی هەر وەکوو گوتم کێبڕکێکارێکی بەهێزی هەیە، لە داهاتوشدا دەبێ لەگەڵی سازگار بێ و خۆی بگونجێنێ. ئەگەر وانەکا سەرەنجام تووشی لاواز بوون دەبێ.**

**لەم بەشەدا باسەکەمان زیاتر روویەکی فەلسەفی هەیە، دەمهەوێ بە شێوەیەکی کورت و پوخت باس لەوە بکەم ئێمە کە ئایینمان بەلاوە گرنگە لە دونیای ئەمرۆدا چۆن دەتوانین لەم بابەتە بڕوانین؟ و چ بەرهەمێکی بۆمان دەبێ؟ تا جێگاو پێگەی خۆمان بزانین. لەبەشی یەکەم باسم لەوە کرد کە مشتومڕی نێوان زانست و ئایین لەگەڵ**

کتێبی پیرۆز بە تایبەت تەورات دەستی پێکرد، تاگەیشتە سەدەی نۆزدەیەم و هاتنی داروین و دوای ئەو کەم کەم مشتومڕی زانست لەگەڵ خودا سەریهەڵدا. کەسانێك گەیشتنە ئەو دەرئەنجامەی کە تیۆرییەکانی زانستی و لە سەرووی هەموویانەوە تیۆریەکەی داروین بێ نیازمان دەکات لە چەمکێك بە ناوی خودا. بی نیاز بوون لە چەمکی خودا واتە: لەجیاتی سوود وەرگرتن لە چەمکی خودا بۆ روونکردنەوەی روداوەکانی جیهان، دەتوانین ئەو رووداوانە بە پشت بەستن بە یاساکانی سروشتی و مرۆیی کە بە ئەزموون وەدەستهاتوون، روون بکرێنەوە و لەبەر هەندێ پێویست بە هێنانە پێشەوەی چەمکی خودا ناکات.

چیرۆکێکی بەناوبانگ هەیە، کە ئەستێرەناسی فەڕانسی "لاپلاس" کە لە سەدەی هەژدەیەم ژیاوە، کتێبێکی بە ناوی "میکانیکی ئاسمانی" نووسی و بە دیاری بردی بۆ ناپلیۆن. زاناکانی دەوروبەری ناپلیۆن پێیان گوتبوو کە لاپلاس لە کتێبەکەیدا سوودی لە چەمکی خودا وەرنەگرتووە، چونکە نیوتن لە کتێبەکەیدا باسی کردووە. نیوتن لە میکانیکی خۆیدا پێویستی بەوە هەبوو کە خودا ڕۆڵی هەبێ، لەبەر ئەوە گوتی ئەم جیهانە لەبەر یەك هەڵدەوشێ و کاتێك هەسارەکان لە تەوەری خۆیان دەردەچن، خوداوەند دووبارە دەیانهێنێتەوە شوێنی خۆیان. بەم شێوەیە ڕۆڵی خودای دیاری کردبوو لە جیهان و لەم ڕێگەیەشەوە کەلیساشی لە خۆی رازی کردبوو، بەلام لاپلاس وای بیر دەکردەوە کە میکانیکێکی ئاسمانی کامڵی نووسیوە کە پیویست ناکات لەوێدا باس لە خودا بکات. دەڵێن ناپلێۆن لێی پرسی: "بیستومە لە کتێبەکدا باسی خودات نەکردووە؟" ئەویش گوتویەتی: "قوربان من پێویستم بە گریمانەیەکی لەوجۆرە نییە!"واتە هەوەڵ ئەوەی کەخودای هێنایە ئاستی گریمانەیەك و دووهەم گریمانەیەك کە لاواز بووە. بەو دەربڕینەی کە دواتر میژوو نوسان دەیانگوت: "خودا گۆڕدرا بۆ ئەندازیارێکی خانەنشینکراو." واتە رۆژێك رۆژگارێك خودا ئەم جیهانەی دروست کردووە و دواتر وازی لێهێناوە وخانەنشین بووە، کاروباری دونیاش واتە هەڵسوڕانی ئەم جیهانەشی داوەتە دەست مرۆڤەکان و یاسا و هێزەکانی سروشت. ئەم تیۆرییە لە لای زاناکان گومانی لەسەر بوو و لەسەردەمی ئێمە ئەو گومانە زیاتر بووە، دەستی مرۆڤ والآتر بووە بۆ دەستبەسەرداگرتنی سروشت و خۆی وەکوو خودای جیهان دەردەخات کە دەتوانێ هەموو کارێك ئەنجام بدات.. هەروەکوو پێشتریش باسم کرد، تەکنەلۆژیا سروشتی دوومە کە مرۆڤ وەدی هێناوە. لە ڕێگای "ئۆتۆماسیۆن" و

**یاساکانی سروشت وا خۆی نیشان دەدا کە لە داهاتوو هەموو شتیك کۆنترۆل دەکات و بەشێوەی زانستی و کرداری  چەمکی خودا لە گۆڕەپان وەلا دەنێ.**

**بە شێوەی شیکاری هەوڵ دەدەین هەر لەم باسەوە دەست پێ بکەین تا دەگەینە بابەتانێکی ئاسانتر، من هەوڵ دەدەم بە شێوەی پێچەوانە مێژوو شیکار بکەم. لە قورئاندا وتەیەك هاتووە کە بە هەمان شێوە لە ئایینەکانی دیکەش ئەم ووتەیە هاتووە: بەشێك لە ئیمانی باوەرداران تایبەتە بە "غەیب". غەیب چییە؟ غەیب رێك ئەو شتەیە کە زانست نکۆڵی لێ دەکات یان رەتی دەکاتەوە، واتە دەڵێ لەودیو مادەوە یا لە دەرەوەی سروشت، بوونەوەرێك کە لە ئێمەوە نادیار بێ، بوونی نییە. لە بنەڕتدا نکۆڵی کردنی غەیب سەرەتایی ماتریالیزمە. واتە ئەگەر تۆ بڵێی کە هەموو جیهان لە یاساکانی سروشتدا کۆدەبێتەوە، و سروشت لە سەر تەوەری خۆی دەسوڕێتەوە و پێویستی بە هیچ پاڵپشتیەکی دیکە نییە، لەو کاتەدا نکۆڵی غەیب دەکەی. غەیب یان بونەوەری نادیارن یان هێزی نادیارن. من ئا لیرەوە دەست پێدەکەم، جارێ بابەتی خودا دەخەینە ئەولاوە، بەڵام ئاماژە بە هەندێ بابەتی غەیبی دەکەم کە باوەرداران ئیمانیان پێیەتی. ئێمە لێرەدا سێ چەمکمان هەیە کە پێویستە قسەیان لەسەر بکەین؛ دۆعا، موعجیزە و رۆح. ئەم سیانە پەیوەندیان بە غەیبەوە هەیە. ئەم سێ چەمکانە لەوانەن کە بە جیددی کەوتونەتە بەر نکۆڵێ کردن لە لایەن زانایانی زانستی ئەزمونیەوە. هەروەکوو دەزانن  دۆعا لە ئاییندا رۆلێکی بنچینەی هەیە و بەڵکو بگرە لەوە بنچینەیی تر شتێك نییە لە ئاییندا. ئێمە هەندێك فیلسوف دەناسین کە بوونی خودا دەسەلمێنن، بەڵام هیچ فیلسوفێك باس لە چەمکی دۆعا ناکات، واتە پەیوەندی خودا لەگەڵ ئەم جیهانە لەو پەیوەندییە نەناسراو یان نەزانروانەیە لە فەلسەفەدا. زانست لە عەسڵدا باوەڕی پێی نییە و خۆی تێ هەڵناقورتێنێ،  لە ئەفلاتون و ئەرستۆڕا بگرە کە خودایەکی تایبەتیان دەسلماند تا دواتر گەیشتە رومییەکان. دۆعا کردن ئایینەکان هێنایانە کایەوە و  فێری خەڵکیان کرد، مەولانا چەندین جار باس لەمە دەکات:**

هم دعا از تو اجابت هم ز تو

ایمنی از تو مهابت هم ز تو

ما ز آز و حرص خود را سوختیم

وین دعا را هم ز تو آموختیم

ئەم وتەیە زۆر گرینگ و بنەڕەتیە. واتە ئێمە دۆعا کردن لە فیلسوفانەوە فێر نەبووینە هەتا لە فیلسوفانی ئیسلامییش. فەلسەفە توانای خستنەڕووی چەمکی دۆعای نییە. بەومانایەی کە ئێمە دواکاری لە بەرزترین و لە سەروترین بوونەوەری هەموو جیهان بکەین واتە خودا، ئەویش لەم جیهانە وەڵامی داواکارییەکانمان بداتەوە. ئەمە ئەو شتەیە کە زانست هیچ شونێکی لەخۆیدا بۆ نادۆزێتەوە. هەروەك گوتم فەلسفەش ناتوانێ لە خۆیدا شوێنی بکاتەوە. ئەوانەی ئاشناییان لەگەڵ فەلسەفەی فیلسوفانی وەکوو "ئین سینا" و "مەلا سەدرا" و "میردماد" هەبێ، دەزانن کە ئەوان لەم باسەدا دەستیان بەستراوەتەوە. ئەوپەڕی قسەیان لەم باسەدا ئەوەیە کە دەلێن بوونەوەرانێك هەن جگە لە خودا، بەلاٚم لە خوداوە نزیکن کە ئەوان دەنگی ئێمە دەبیستن و جێبەجێی دەکەن. من لێرەدا کارم بە میکانیزمی دۆعا و چۆنیەتی  گیرابوونی دۆعا نییە. ئەگەر لە ڕوانگەی زاناییەکی ئەزموونییەوە لێی بڕوانین بە ئەستەم دەتوانێ باوەڕ بکات کە هێزێك بە ناوی دۆعا لەم جیهانە بوونی هەبێ و گۆڕانکاری گەورە بخوڵقێنێ. واتە دۆعا بکەی خودا منداڵت پێ بدات، دۆعا بکەی تەندروست بی، دۆعا بکەی  قەرزەکانت بدەیەوە و دۆعا بکەی حکومەتێك بڕوخێ. هەروەك دەزانین کۆمەڵگا ئایینیەکان سەرقاڵن بە دۆعا کردن و دۆعا کاری هەموو رۆژێکی ئێمەیە. ئەگەر ئەم دۆعایە نەبێ واتە ئەم پەیوەندییە لەگەڵ خودا نەبێ، لە راستیدا ئەو کات ئێمە پاڵپشتی خۆمان لەدەست دەدەین و مانای دینداری وەلادنرێ و بێ باوەر دەبین. لە روانگە و دیدی زانایەك: "چەمکێکی لەم جۆرە مانا نابەخشێ کە هێزێکی ئاوا لە جیهان بوونی هەبێ. ئەگەر ئێوە بتانهەوێ حکومەتێك بڕوخێنن دەبێ هەوڵی بۆ بدەن. ئەگەر بتهەوێ نەخۆشێك چارەسەر بکەی دەبێ هەولی بۆ بدەی، هەر شتێکی هاوشێوەی ئەمە وەکوو دانیشتن و دۆعا کردن سوودبەخش نابێ و لەبەرئەوەی لە بنەرەتدا شتێکی لەم جۆرە بوونی نییە."

جگە لەمەش ئێمە دۆعاگەلێکی زۆرمان هەیە کە بێ وەلام ماونەتەوە، واتە زۆربەی خەڵك کە دەپاڕێنەوە خۆشیان دەزانن کە هەندێ جار دۆعاکانیان گیرا نابێ، وەك ئەوەی بڵێی خودا نایبیستێ یان دەیبیستێ بەلاٚم وەلاٚم ناداتەوە یان ئەسڵەن خودایەك نییە کە بیبیستێ،  بە هەرحاڵ مرۆڤ دەتوانێ هەموو جۆرە گریمانەیەك بکات. ئەمە خاڵێکە واتە بۆ زانایەك کە لە روانگەی ئەزموونییەوە تەماشا دەکات پرسیارێکی گرنگی بۆ دروست دەبێ کە دۆعا لەم

جیهانە چی دەکات ؟ کەسێکی ئیماندار چۆن دەتوانێ وەڵامی بداتەوە؟ من لێرەدا تەنیا لەم رووەوە دەدوێم، سنوری باسەکەی من ئەمەیە کە ئایا دۆعا کردن لەگەڵ زانایەکی زانستی ئەزموونی کە روانگەیەکی زانستی بۆ جیهان هەیە، ناکۆکی هەیە یان نا؟ ئەوەی کە دۆعا بۆخۆی چییە، یان ئەوەی کە دۆعا لە سەر چی میکانیزمێك گیرا دەبێ و شێوازی کاریگەربوونی لەم جیهانە چۆنە، یان خودا کە هیچ شتێك کاری تێناکات چۆن دۆعا کاری تێدەکات، ئەم باسانە باسی خواناسییە و باسی ئێستای ئێمە نییە. من لەو رووەوە باس دەکەم کە ئایا زانست دەتوانێ بڵێ  دۆعا شتێکی بێ بنەما و پوچەڵە یان خورافات و ئەفسانەیە. یان دەتوانێ بڵێ دەبێ وازی لێ بهێنین لەبەرئەوەی زانست نەیتوانییوە پەی پێ بەرێت یان نەیتوانیوە هیچی لێ دەستکەوێ؟

لە بابەتی دۆعا تێدەپەڕین و دەچینە سەر موعجیزات. موعجیزە لە لامان ئاشنایە. لە راستیدا یەکێك لە موعجیزاتی ئەم دونیایە، خودی دۆعایە، بەلام لێرەدا دێینە سەر ئەو موعجیزانەی کە لە ناو کتێبە ئایینیەکاندا باس کراون. لەوانە تۆفانی پێغەمبەر نوح خۆی موعجیزە بووە، هەروەها پێغەمبەر ئیبراهیم و ئەوانەی لە دوای ئەوانیش هاتوون، هەروەك دەبینین لە کتێبە پیرۆزەکاندا زۆر شت لەم بارەیەوە باس کراون کە چەندە خاوەن ڕێز بوونە و پلەیەکی تایبەتیان لە لای خوداوەند هەبووە. تاکو دەگەینە پێغەمبەر موسا کە شکستی بە فیرعەون هێنا و دەریای سووری شەق کرد و گۆچانەکەی دەستی دەبووە ئەژدیها، دواتر دەگەینە حەزرەتی عیسا کە موعجیزاتی زۆری هەبوون، لەوانە مردووی زیندوو دەکردەوە و نەخۆشی چاك دەکردەوە، لە کۆتاییدا بە شێوەی موعجیزە لە دەست دوژمنانی رزگاری بوو و بەرەو ئاسمان رۆیشت، هەروەکو لە مێژووی مەسیحیەتدا دەیخوێنینەوە. لە دوای هەموویان دەگەینە پێغەمبەری ئیسلام کە "ئیبن خەلدون" قسەیەکی هەیە کە من زۆرم لە لا پەسەندە، دڵێ: "پێغەمبەر لە دوو موعجیزە زیاتری نەبووە، یەکەم یەکخستنەوە و ئاشتکردنەوەی قەبیلە عەرەبەکان بوو کە ساڵانێکی زۆر دوژمنایەتیان لەگەڵ یەکتردا هەبووە، دووهەمیشیان قورئان بووە. " هەڵبەت لە کتێبەکانی مێژووی ئیسلام موعجیزاتی زۆریان لەسەر پێغەمبەر گێراوەتەوە. لەوانە ئەوەی کە بانگی درەختێك دەکات و درەخت لە شوێنی خۆی هەڵدەقەندرێ و وەرێدەکەوێ بۆ لای پیغەمبەر. نمونەی زۆری لەم جورە لە کتێبەکاندا باس کراون. هەرچەندە زۆر دڵنیا نین لە ڕاستی ئەمانە، بەڵام بە هەرحاڵ جۆرێکن لە موعجیزە. هاوکات ئەم موعجیزانە تەنیا تایبەت نەبوونە بە پێغەمبەران وەکوو دەگێڕنەوە، بەڵکو کەسانی خاوەن ڕێز وکەرامەتیش "ئەولیا" شتیان

لەدەست هاتووە، کەمترین توانایان ئەوە بووە کە توانیویانە مێشکی کەسانی دیکە بخوێننەوە. ئەوەی کە من بزانم لە مێشك و دڵی تۆدا چی هەیە. لەسەرئەو بنەمایە من کاردانەوەم هەبێ و ڕێنموویت بکەم. دەڵێن میعراجی پێغەمبەریش موعجیزە بووە. ئەوەی کە پێغەمبەر بە شەو لە مەککەڕا هاتووە بۆ فەلەستین و لەوێڕا چووە بۆ ئاسمان و شتە غەیبییەکانی بینیوە و دواتر گەڕاوەتەوە و هەموو ئەم سەفەرەش لە چاوتروکانێکدا بووە. ئێوە ئێستا لە راست و ناڕاستی ئەماانە گەڕێن. بیرلەمە بکەنەوە کە مێژووی ئایین پڕە لەم ڕووداوانە. خەڵکانی ئیماندار باوەری تەواویان بەمانە هەیە، هەروەك چۆن لە کەلیساکان دەبینین کەخەڵك لەپێغەمبەر عیسا دەپارێنەوە و داوای بەدەستهێنانی پێویستیەکانیان دەکەن. هەورەك لە هەموو پەرەستگاکانی دیکە خەڵك بۆ پێویستیەکانیان داوا لە پیاوچاکان دەکەن ئەوانەی کە لە دونیا نەماون، کە مرازیان حاسڵ بێ. بەڵێ، ئەم موعجیزاتانە بە رواڵەت یەکێکی دیکەن لەو شتانەی کە زانست کێشەی هەیە لە پەسند کردنی و بە خورافات لە قەڵەمیان دەدات، هەڵبەت ئێمە دەزانین کە خوڕافات زۆرن و لە هەموو کەلتورێکدا بوونیان هەیە، بەڵام ئێمە لێرەدا باس لە هەندێك شت دەکەین کە لە روانگەی زانستەوە بە خورافاتی ئایینی ناودەبرێن. لە راستیدا زانست لە جیهانی نوێ گوتویەتی: "پێوانە و تەوەری عەقڵانیەت لای منە. هەرچی لەگەڵ ئەم پێوانە و تەوەرەیەی من سازگاری نەبێ، دەکەوێتە ناو بازنەی خورافات." زانست نە دوعا دەناسێ و نە موعجیزەش، تۆ لە هیچ کتێبێکی زانستی کە ئەمرۆ چاپ دەکرێ و لە زانکۆکان دەخوێندرێ، نابینی باس لە موعجیزە بکرێ یا روداوێك بە بێ هۆکار چۆن روویداوە، بەڵام لە کتێبە ئایینیەکان ئەم شتانەی زۆر تێدایە.

سێیەمیش چەمکی رۆحە. ئەوەی کە مرۆڤەکان روحیان هەیە، هەڵبەت رۆحێك کە لەناو ناچێ، واتە دوای مردنی ئادەمیزاد رۆح هەر دەمێنێتەوە و بەردەوام دەبێ لەسەر ژیانی خۆی و بەدبەختی و خۆشبەختیشی هەیە، و جیهانێکی نوێ بۆ خۆی دەدۆزێتەوە و لەوێدا بۆ هەمیشەی دەمێنێتەوە. ئەمرۆ زانایانی "زانستی دەماری" کە لە سەدەی بیستەم ئەم زانستە پێشکەوتنی بەرچاوی بە خۆیەوە بینی، لەسەر ئەو بڕوایەن کە ئەو باسانەی کە پێشینیان لەسەر تیۆری نفس یان روح باوەڕیان پێ بوو، ئێستا ئێمە بە هۆی دەمارەخانەکانی مێشك دەتوانین باس لەو رووداوانە بکەین. بۆنموونە ئەگەر خەون دەبینی، ئەگەر دەتوانی پیش بینی بکەی، ئەگەر هەست بە هەندێك ئەزموونی ئایینی دەکەی، ئەگەر بیردەکەیەوە لەوەی وەحی بۆ پێغەمبەران هاتوە و لە رۆحی ئەواندا

رووداوگەلێك روویداوە، ئەمان ئیدیعای ئەوە دەکەن کە بە هۆی زانستەکانی بایۆلۆژی، دەماری، ئەلکترۆنیك و کیمیا و لەرێگەی ئەو رووداوانەوە کە لە دەمارەخانەکانی مرۆڤدا روودەدا، دەتوانن هەموو ئەو شتانە روون بکەنەوە، و ئەگەر بەشێکیش لەمانە کە تا ئێستا روون نەبوونەتەوە، ئومێدێکی زۆر هەیە کە لە داهاتوو ئەوانیش رۆشن ببنەوە. بەم جۆرەیە کە بە هۆی زانست، کەسانیك کە هزری زانستیان هەیە لەدۆعا دووری دەگرن و هەورەها بەرامبەر موعجیزاتیش بیٚ باوەر دەبن. هاوکات باوەڕیشیان بە رۆح و بە دونیای دیکەش لە دەستدەدەن. ئەمە مشتومڕی زانست و ئایینە، لەبەر ئەوەی هەموو ئەم چەمکانە بەشێکن لە ئایین و هەندێك شتی دیکەش هەن کە ئاماژەیان پیٚ دەکەم.

ئێمە دەتوانین چی لەم بارەیەوە بلێین؟ چۆن دەتوانین داوەری بکەین؟ قسەی سەرەتای من ئەوەیە کە بە هیچ جۆرێك نابیٚ بەرامبەر بە زانست گومانی خراپ بەرین، لەبەرئەوەی زانستەکان کاری خۆیان ئەنجام دەدەن و بەرەوپێشچوونی خۆیان هەیە و چوارچیوەیەکیان دیاری کردووە  کە لە ناو ئەو چوارچیوەیەدا کاری خۆیان ئەنجام دەدەن. دەستکەوتی گەورە و بەسوودیشیان هەبووە و دەبیٚ، کە لەم لایەنەوە هیچ گومانێك نییە. بابەتەکە ئەوەیە کە ئایا دەستکەوتە زانستیەکان لەگەڵ ئەم چەمکانە تێکدەگیرێن؟ ئایا یەکیان ئەوی دیکە پوچەڵ دەکاتەوە یان نا؟ وڵامی من ئەوەیە کە نەخێر. بەو جۆرە نییە. گەرچی زۆرێك و ا بیر دەکەنەوە. هەڵبەتە کە بە هۆی ئەزمونەوە ناتوانریٚ دۆعا بسەلمێندرێت، لەبەرئەوەی دۆعا چەمکێك نییە لە چەمکەکانی زانست. هەڵبەتە کە موعجیزە ناکریٚ بە هۆی ئەزمونی زانستیەوە بسەلمێندرێت، لەبەرئەوەی کە روداوگەلێك نین کە رونکردنەوەی زانستی لە خۆبگرن. بەهەمان شێوە ناکریٚ رۆح بە هۆی ئەزمونی زانستیەوە بسەلمێندرێت، بەڵام ناشکریٚ بگوتریٚ هەرچییەك بە هۆی زانستەوە ناتوانریٚ بسەلمێندرێت، پۆچەڵە. خاڵی سەرەکی لێرەدایە.  ئەوەی کە ئێمە بۆچی باوەرمان  بەو سیٚ چەمکانە هەیە، ئەوە بابەتێکی دیکەیە، دەکریٚ ئەو پرسیارە لە ئیماندارن بکریٚ. لێرەدا باس لەوە ناکەین. بەڵگەکانی ئەوان چین کە باوەریان بە دۆعا و رۆح و موعجیزە هەیە، یاخود ئایا بەڵگەکانیان پەسەند و پتەون، ئەوە دەچێتە ناو بازنەیەکی دیکە بە ناوی خوداناسی (ئیلاهیات). لێرەدا ئێمە تەنیا لەسەر رووبەڕووبونەوەی نێوان زانست و ئایین دەدوێین.

کاکڵی بابەتەکە ئەمەیە: "هەرشتێك بە هۆی زانستەوە نەسەلمێنرا ناکرێ بگوترێ پوچەڵە." زۆر شت هەن کە دەستی ئەزمونی ئێمە پێیان ناگات و دەستی ئەزموونی هیچ زانایەکیش پێیان ناگات، بەڵام نابێتە بەڵگە بۆئەوەی بگوترێ مادام نەمدۆزیوەتەوە کەوابوو پوچەڵە. هەڵبەت دەکرێ بڵێین ئەگەری ڕوودانی زۆر کەمە و یا ئەوەی کە یەخەی ئیمانداران بگرن و لێیان بپرسن ئێوە بۆ باوەرتان پێ هەیە لەسەر چ بنەمایەکی ئەقڵی دەیسلەمێنن؟ ئەمە پرسیارێکی بە جێیە. واتە ئەگەر کەسێك باوەری بە موعجیزە هەیە نابێ بێ بنەما بێت واتە دەبێ ڕوونی بکاتەوە کە بۆچی شتێکی لەو جۆرە شیاوی ڕوودانە یان "مومکین"ە. کەوابوو لێرەدا هیچ تێکهەڵچونێك نییە، لایەنێك لە چوارچیویەك کاردەکات و کاری بەلایەنەی دیکە نییە. لەبەرئەوە نە دەیسەلمێنێ و نە ڕەتیشی دەکاتەوە. ئەگەر دەبینی کەسانێك ئیدیعای بێسوود دەکەن، بزانن کە ئەوانە بە تەواوی ئاگاداری ڕەوش و یاسا زانستیەکانی خۆشیان نین.

ئەگەر ئادەمیزاد بازنەی لێکۆڵینەوەکانی خۆی بزانێ کۆێیە، هەڵبەت کە پێی لەو بازنەیە ناخاتە دەر، یاخود ئیدیعای زیاتر ناکات. هەر وەکوو گوتم دەتوانێ هەمیشە ئەو پرسیارە بکات، کە من پێی نەگەیشتوم تۆ چۆن پێی گەیشتوی کە باوەڕت پێیەتی. ئەمە پرسیارێکی پەسەندو بە جێیە، بەلام ناتوانێ بەڵێ لەبەر ئەوەی من پێی نەگەیشتووم کەوابوو بوونی نییە. ئەمە وتەیەکی ژیرانە و مەعقول نییە. دەبێ لێرەدا ئاماژە بە خاڵێك بکەین، ڕاستە کە مشتومرێك نییە هەورەها ئەوەش ڕاستە کە بەجێ نییە بڵێین کە لەبەر ئەوەی من پێی نەگەیشتوم کەوابوو بوونی نییە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئێمە ئەوەندە ڕێگا چارەی نوێمان دۆزیوەتەوە بۆ چارسەرکردنی کێشەکان کە ئیتر بیر لەو ڕێگا چارانەی پێشتر ناکەینەوە، کە مرۆڤەکان لێی سارد بوونەتەوە. لەوانەیە ڕۆژگارێك کە هەندێك نەخۆشی چارەسەری نەبووە، ئێمە پێمان خۆشتر بوو کە لەو کاتەدا زیاتر پەنا بۆ دۆعا بەرین، بەڵام ئەگەر ئێستا بزانین دەرمانێك هەیە و چارەسەری نەخۆشییەکە دەکات لەوانەیە لەو ڕەوشانەی دیکە سارد بینەوە. ئەگەر تەواو دڵنیا بوویەوە کە بە دەرمان نەخۆشیەکە چارەسەر دەبێ ئیتر دۆعا ناکەی، بەڵکو دەرۆی ئەو ڕەوشە چارەسەرییە دەگریتە بەر و پێشی چاك دەبییەوە. ئێوە لە نەخۆشخانەکان ناوەندێکی دۆعا کردن نابینین، لەبەرئەوەی باوەریان بەشتێکی لەوجۆرە نییە. خودی زاناکان خۆیان دۆعا ناکەن بۆ نموونە بڵێن خوایە نرخی ئەو شتانە دابەزێنە یان نرخەکان بەرز کەوە، چونکە دەزانن ئەو شوێنانە زۆر جێگای دۆعا کردن نییە، بەڵام

کاتێك ئەم ڕێگەچارەسەرانە نەبێ مرۆڤ زیاتر پەنا بۆ ڕەوشی دۆعا کردن دەبا. لە ولاتی ئێمە جاروبار نوێژە بارانە دەخوێنن، واتە کاتێك وشکە ساڵی دەبێ و باران کەم دەبارێ، دۆعا دەکەن. باشە ئێستا ئەم شێوە چارەسەرانە بۆ بەرەو کەمی ڕۆیشتوون؟ لەبەرئەوەی کە مرۆڤەکان بەوە گەیشتون کە بۆ باران بارین و ئاودێری کردن زیاتری زەوییە کشتوکاڵییەکان دەبێ ڕێگای دیکە بگرنە بەر. لەبەرئەوەی هەمیشە پوچەڵیی خودی ئەو شتە نییە کە دەبێتە هۆی لاواز بوونی، بەڵکوو دەرکەوتنی کێبرکێکارێکی دیکەیە کە لە گۆڕەپانەکە دووری دەخاتەوە، هەرچەند ئەگەر نەشمان توانیبێت پوچەڵی بکەینەوە.

بەڵام ئەی موعجیزات چۆنن، پێم خۆشە کەمێك زیاتر لەو بارییەوە بدوێم. جاری وایە ئێمە لەبارەی "ئیمکان"ی شتێکەوە دەدوێین وجاری واشە لەسەر وەڕاست گەڕانی یان حەقیقەتی شتێك قسە دەکەین. من لێرەدا لەسەر ئیمکانی ئەو شتانە قسە دەکەم. ئەوەی کە فلان موعجیزە ڕویداوە یان نا، ئەوە تەوری باسەکەی ئێمە نییە. ئەوە کاری مێژوونوسانە کە ئایا بەڕاستی موسا بە گۆچانەکەی دەستی دەریای سووری شەق کردووە؟ ئایا بەڕاستی نەتەوەی بەنی ئیسرایل بەو دەریایەدا تێپەڕیون؟ یان ئەوەی کە گۆچانەکەی دەبووە مار؟ ئەگەر ئەم پرسیارانە لە زانایانی زانستی ئەزمونی بپرسی، دەڵێن: "نەخێر، ئێمە لە توێژینەوە سروشتیەکانمان نەمادیووە کە دارێك ببێتە مار، یان نەماندیوە منداڵ بە بێ باوك بێتە دونیاوە." کەچی مێژووی مەسیحیەت دەڵێ کە عیسا بە بێ باوك هاتۆتە دونیاوە.

بەڵام دیوەکەی دیکەی باسەکە ئەوەیە کە ئایا بەڕاستی "مومکین"ە یان نا، تەوەری قسەکەمان ئەمەیە. ئایا دەکرێ روداوێکی ئاوا دەگمەن روو‌بدات؟ منداڵێك بە بێ باوك بێتە دونیاوە؟ ئا لێرەدا دەبێ زەمینێکی دەقیقی فەلسفی لێی بڕوانێت. ناکرێ بەتەنیا لە ڕێگەی روانگەکانی زانستیەوە لێی بڕوانرێ. من دەمهەوێ پەنجەی شیکار بخەمە سەر ئەم بابەتە. یەکەم: سەلماندنی ئەوەی کە شتێك لەم جیهانە مەحاڵە لە گەورەترینی کێشەکانە. هەتا لە زانستی لۆژیك و بیرکاری ئەم قسەیە دەکەن: " سەلماندنی مەحاڵبوونی شتێك لەڕادەبەدەر وزەی پێویستە و ڕێگەی زۆر ئاڵۆز و دژواری هەیە." ئێمە ئەوشتانەی کە لە جیهاندا دەیانبینین "مومکینات"ن. واتە ئەوەی کە ئێمە لێرە دانیشتوین ئێستا، مومکین بووە بۆیە لێرە دانیشتیون. یان ئەگەر زەوی بە دەوری خۆردا دەسۆڕێتەوە، مومکین

بووە کە بە دەوریدا دەسوڕێتەوە. لەبەر ئەوە هەرشتێك کە دەیبینین بەشێکە لە مومکینات. ئێمە ناتوانین هیچ مەحالێك لەم دونیایە ببینین. لەبەرئەوەی کە مەحاڵە، ناتوانرێ ببیندرێن. ئەگەر بتوانین مەحاڵ ببینین، ئەوە مەحاڵ نییە بەڵکو مومکین بووە کە پەیدا بوو، بۆیە ئێمە ئەزمونی یاخود تەجرەبەی مەحاڵ ناکەین، واتە مەحاڵ ڕوونادات کە بتوانین تەجرەبەی بکەین، بەڵکو ئەوانەی کە تجرەبە دەکرێن هەموویان مومکیناتن، ئەوە خاڵی یەکەم. خاڵی دووەم ئێمە مومکینات تەجرەبە دەکەین، بەڵام نەك هەموو مومکیناتێك، لەبەرئەوەی زۆرن. بۆیە ئەوانە ئەزمون دەکرێن کە دەکەونە ناو بازنەی ئەزمونی ئێمەوە. ئەو شتانەی کە دەیانبینین دەتوانین بیانناسین و دەستمان پێیان دەگات. چەندین سەدە ئێمە لە بارەی ئەستێرەکانەوە شتێکی وامان نەدەزانی، کەرەستەی زانستی پێویستمان نەبوو. بەڵام ئەمرۆ زۆر شت لە بارەی ئاسمانەکان دەزانین. لەبەر ئەوەی بازنەی ئەزمونیمان گەیشتۆتە ئەو شوێنانە و دەتوانین ئەم بازنەیە بەرفراوانتر بکەین، بەڵام هەرچەندەش فراونتری بکەین هەر لە ناو بازنەی مومکیناتە. ئەوشتانەی کە نەماندیوە نابێ بڵێین لە بازنەی مومکینات بەدەرن و لە بەشی مەحاڵن.

با ئێستا بێینە سەر خاڵێکی گرنگتر لەمە، ئێمە هەمیشە باس لە یاساکانی زانست دەکەین. یاساکانی زانستی یانی چی؟ بریتین لە کۆمەڵە یاسایەك کە دەڵێن یەکەم جار A ئەوجار B. حاڵەتی زۆر لەمە ئاڵۆزتریان هەیە، ئەمە زۆر سادەیە. لە زانستدا ئێمە دەڵێین یەکەم جار A ئەوجار B، ئەمە بەشێکە لە یاسای سروشت. ئێمە ئەم یاسایانەمان چۆن بەدەست هێناوە؟ بەهۆی ئەزموون و توێژینەوە "استقرا"، واتە بەشەکانی شتێکمان بینیوە و لە تەنیشت یەکمان داناوە و دەرئەنجامەمان بەدەست هێناوە. کاتێك دەڵێین A ئەجار B یانی: زۆر بینراوە کە هەرکاتێك A ڕویدابێت ئەوا بە دوای ئەودا B ڕوودەدات. ئەمە بەمانای توێژینەوەیە "استقرا". بەجۆرێك ئێمە دڵنیا بووینەتەوە کە لە حاڵەتی تایبەتی A دەرئەنجامە بۆ B. ئەگەر بمانهەوێ ئەمە بە شێوەی لۆژیکی باس بکەین بەم جۆریە: " A مەرجی کافیە بۆ ئەوەی B رووبدات، بەڵام مەرجی لازم نییە." واتە هیچ کات ئێمە ناڵێین حەتمەن دەبێ A رووبدات تا B رووبدات، بەڵکو دەڵێین کافیە A هەبێ ئەوجار B دێت. ئەمە خاڵێکی زۆر گرنگە لە فەلسفەی زانست، کە یاساکانی زانست مەرجی کافی ڕووداوەکان دەخەنە روو، نەك مەرجی لازم یان پێویست. واتە ناڵێن کە تەنیا لەم ڕێگەیەوەیە B ڕوودەدات، بەڵکو دەڵێن ئەگەر A ببێ B ڕوودەدات. لەوانەیە تۆ بتوانی لە ڕیگەیەی دیکەشەوە بگەیتە B، بەڵام ئێمە ئەم ڕێگەیەمان دۆزیەوتەوە. نموونەی ئاسان زۆرن لەم

بارەیەوە. نەخۆشییەك دەكرێ بە چەند جۆر دەرمان چارەسە بكرێت. واتە بەم جۆرەی لێ دیتْ: A ئەوجار B یان C ئەوجار B  یاخود D ئەوجار B. ئێمە هەمیشە لە یاساكانی سروشت باس لە مەرجە كافیەكان دەكەین، نەك مەرجە زەرورییەكان.

ئێستا با بچینە سەر لە دایك بوونی پێغەمبەر عیسا و بەم یاسایە بیخەینە روو،  مەرجی كافی بۆ لەدایك بوونی منداڵێك ئەوەیە كە ژنێك لە گەڵ پیاوێك بخەوێ، ئەمە مەرجی كافییە. ئەگەر كەسێك پێی وایە ئەمە مەرجی لازمە، بە هەڵەدا چووە، لەبەرئەوەی ئەمە مانای یاسای زانستی نییە. واتە ئەگەر ئێمە وا بیركەینەوە تاكە ڕێگەی پەیدا بوونی بونەوەرێكی زیندوو یان كۆرپەلەیەك ئەوەیە كە پیاوێك لەگەڵ ژنێك بخەوێ، هەڵەیە. دەزانم لەوانەیە ئەمە لە لایەن ئێوەوە نكۆڵی لێبكرێ! بەڵام دەبێ بیری لێ بكەیەوە، ئەمە دەرئەنجامی دەقیقی لۆژیكی مێتۆدە زانستیەكانە. لە زانستدا ئێمە بەدوای مەرجی كافی  رودانی روداوەكانین. دەڵێین كافیە بۆ چارەسەركردنی سەرئێشە ئەو دەرمانە بخۆی، كافیە بۆ ئەوەی دەرمانی شێرپەنجەكەت بكەی لەو ڕێگەیەوە بڕۆی یان ئەو مێتۆدە بەكاربهێنیت. كەس نالێ لازمە یان زەرورییە تەنیا ئەو رەوشە بە كار بهێنی، چونكە جورئەت ناكا ئەو قسەیە بكات. هیچ زانایەك ناتوانێ بڵێ تەنیا ریگەی چارەسەر هەر ئەمەیە و هیچ مێتۆدێكی دیكەش نادۆزرێتەوە بۆ چارەسەركردن، و دڵنیاتان دەكەمەوە. كێ و چ زانایەك دەتوانی ئەم قسەیە بكات؟ بەڵام كێشەكە ئەوەیە كە ئێمە مێشكمان لەسەر  هەڵەكاری راهێناوە. یەكێك لەو بوارانەی كە هەمیشە ئافەرین بە مەولانا جەلالەدینی رومی دەڵێم ئەویە كە مێشكی  لە بەندی ئەم عادەتانە رەها كردبوو. ئەمە من ناوم لێناوە "خووی زەینی" یان عادەتی زهنی بۆ زانایان. كە لەحیاتی مەرجی كافی، مەرجی لازم دەبینن. مولانا لە چەند شوێنێك دەڵێ، ئەو علییەتەی "هۆیەتی" كە ئێمە دەیناسین عادەتی مێشكی ئێمەیە وخوومان پێگرتووە كە بڵێین ئاو هەمیشە ئاگر دەكوژێنێتەوە و نەوت هەمیشە بڵێسەی ئاگر زیاد دەكات، بەڵام بەومانایە نییە كە هەمیشە بەم جۆرەیە، واتە مەرجی لازم بۆ كوژانەوەی ئاگر، ئاو نییە، دەكرێ لە ڕێگایەكی ترەوە بیكوژێنینەوە. ئەو باڵاتر لەوەش ڕۆیشت، هەر لەسەرەتای دەفتەری سێهەمی مەسنەوی دەڵێ:

این چراغ شمس کو روشن بود

نه از فتیل و پنبه و روغن بود

سقف گردون کو چنین دایم بود

نه از طناب و استنی قایم بود

**ئەم وتەیە ئەمرۆ کەسێك چاك لێی تێدەگات کە لەسەدەی 20 و 21 بێت و "رادیۆئەکتیڤیتە" بناسێ. ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم، شارەزایانی "تێرمۆدایناميك"، شارەزایانی "زانستی فیزیا" و "کیمیازانەکان"، یەکێك لە پرسیارە گرنگەکانیان ئەوەبوو کە وزەی گەرمی و رووناکی خۆر لە کوێوە سەرچاوە دەگرێ؟ پرسیارێکی زۆر بەجێ بوو. سەرچاوەی ئەم هەمووە روناکی و گەرمییەی خۆر چییە؟ ئەوپەری گومانیان بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە ئەوەبوو کە خۆر ئەمبارێکی سوتەمەنییە، سوتەمەنییەکی زۆر بەهێز وەکوو بەنزین و نەفت... لەو کاتەوەی کە هەڵکراوە، هەروا ماوەتەوە تا ئەمرۆکەش هەرخەریکە دەسوتێ. کیمیا هێشتا لەو زیاتر پێشڕەوی نەکردبوو، واتە نەیدەتوانی بزانێ کە ڕێگەیەکی دیکەش هەیە بۆ بەرهەمهێنانی رووناکی و وزەی گەرمی. رادیۆئەکتیڤ ئەم کێشەیەی چارەسەر کرد. زاناکان لەم ڕێگەیەو بە هۆی ئەم کەشفەوە بوو کە پەیان بەوە برد لە ناو خۆر "فیوژنی ناوەکی" یان یەکگرتنی ناوەکی روودەدات. ناوکی گەردیلەکەکانی هایدرۆجین دەچنە ناویەکەوە و هیلیۆم دروست دەبێ و روناکی پەیدا دەبێ و وزەی گەرمیش دروست دەبێ. بە هیچ جۆرێك ئەم ڕەوشە پێشتر بۆ زانایان زانراو نەبوو. عادەتی مێشکی هەموو مرۆڤەکان و هەموو زاناکان ئەوە بوو کە بۆ سوتان پێویستت بە سوتەمەنی هەیە، ئەم سوتەمەنییەش دار، نەوت، خەلوز یا بەنزینە ... هتد. ئەوەی کە مەولانا دەڵێ خودا چرایەکی دیکە "خۆر"ی دروستی کردووە وجیاوازە لەو چرایانەی خۆمان بەکاری دێنین، چراکانی خۆمان پلێتەی هەیە نەوتی هەیە، رۆنی هەیە، بەڵام دەکرێ چرایەکەی دیکە هەبێ کە بە سوتەمەنییەکی دیکە یان بە جۆرێکی دیکە کار بکات. رەها بوون لە عادەتی زەینی، زۆر گرنگە، بەڵام زاڵ بوونی عاداتی زانستی زۆر جار ڕێگربووە لەوەی ئێمە لە دەرەوەی ئەو قەفەسە بیربکەینەوە و بڵێین بە جۆرێکی دیکەش دەکرێ روودبدات. من هەمیشە کاتێك وانە بە خوێندکارەکانم دەڵێمەوە، پێیان دەڵێم: " ئەم جیهانە یەك جیهانی مومکینە، نەك تەنیا**

جیهانی مومکین." لەبەرئەوە زۆربەی ڕووداوەکان کە ڕوودەدەن دەکرێ بە جۆرێکی دیکەش ڕووبدەن. گەرچی ئەو جۆرەی دیکە بەهۆی لاوازی خەیاڵی ئێمەوە بە ئەقڵمان ناگات.

بابەتەکە ئەوە نییە کە هەر موعجیزەیەکیان بۆ گێڕاینەوە باوەری پێ بکەین، بەڵکو لە ڕاستیدا دەبێ لەم بارەیەوە زۆر سەختگیربین. لەبەرئەوەی گێرانەوەی لاواز هەن، ئەقڵ بە ئاسانی ڕوودەکاتە خوراِفات، هەروەك چۆن بە بەرفراوانی ئەم ئاسانگیرییە لە لایەن خەڵکی ئاساییەوە دەبینرێ. بۆیە لە ڕوانگەی هزرڤانێکەوە دەبێ وا بیر بکەینەوە کە ئەم جیهانە بەم تایبەتمەندیانەی هەیەتی و دەیبینین تەنیا جیهانی مومکین نییە، پەردەی هەیە و ئەو پەردەیەش پەردەی دیکەی هەیە، کە ناکرێ نکۆڵی لێ بکرێ. غەیب کە ئایینەکان فێریان کردووین، بۆ قەبوڵ کردنی خورافات نییە، بەڵکۆ بۆ کرانەوەی ئاسۆی ڕوانگەی مرۆڤە کە بیر لە ڕێگەکانی دیکەش بکەنەوە. بیر بکاتەوە کە ڕوداوەکان بۆیان هەیە بە جۆرێکی دیکەش ڕووبدەن. جاروبار لە ژیانی ڕۆژانەمان ڕووبەڕوی ئەم شتانە دەبینەوە، پێویست ناکات هەمیشە بیر بکەینەوە کە زانستەکان ئەو شتانەیان گوتووە یان نا، هەرئەوەندە بزانین کە جیهان زۆر لەوە فراوانترە کە بتوانین بیخەینە ژێر سەیتەرەی ئەزمونی خۆمان یاخود ئەوەی پەی بە هەموو کەلێن و کولێنێکی ئەم جیهانە بەرین.

من تا ئێرە تەنیا لە ئیمکان بوونی ئەوانە قسەم کرد. هەڵبەتە بابەتی ڕۆح ئاڵۆزترە، من زۆر تەئیکد و پێداگری لەسەر ناکەم. لەبەرئەوەی ڕۆح بەشێك نییە لە هزرەکانی ئەرکانی ئایینی. ئێمە لە ناو جیهانی ئیسلام موتەکلیم و فیلسوفمان هەبووە کە باوەڕیان بە ڕۆح نەبووە، کە لە موسڵمانانی موعتەزیلە بوونە، بەڵام باوەڕیان بە ڕۆژی دوای هەبووە. دەیانگوت مرۆڤ دەمرێ، بەڵام دواتر دووبارە دروست دەبێتەوە. ئەوەی کە لەم نێوانەدا ڕۆحێك هەبێ و تا ڕۆژی دوای هەر بمێنێتەوە جیهانی بەرزەخ هەبێ، زۆر باوەڕیان بەمە نەبوو و بە پێویستیان نەدەزانی. پێیان وایە کە باوەڕێکی لەم جۆرەش هیچ بۆشاییەك یاخود هیچ زیانێك بە ئیمانی کەسێکی باوەڕدار ناگەیەنێت. لەبەرئەوە ئەگەر ڕۆژگارێك بایۆلۆژی یان زانستی دەماری پێیان گوتین بۆ ڕونکردنەوەی ڕووداوەکانی ناو جەستەی ئادەمیزاد کە ڕوودەدەن، پێویست بە ئەگەرێك یان چەمکێك بە ناوی ڕۆح ناکات، ئیماندارن نابێ لەم حاڵەتدا بشڵەژێن، هەرچەندە من خۆم باوەڕم بە ڕۆح هەیە، بەڵام لەم بارەیەوە زۆر پێداگری ناکەم، گەرچی دەزانم بابەتی

"هەست و شعور"و هۆشیاری یان"consciousness" یەکێکە لە ڕێگریە گەورەکان بەرامبەر زانایانی زانستی دەمار کە بتوانن ئەو شتانە لە ڕێگەی دەمارەخانەکانی مێشکەوە ڕوونبکەنەوە. ئەوەی کە من لەبارەیانەوە خوێندومەتەوە و بیستومە راستیەکەی مرۆڤ قانع ناکات، بەڵام دەرگای زانست و لێکۆڵینەوە والآیە و لەوانەیە لە داهاتوو بتوانن بگەنە دەرئەنجامێك.

بەڵێ، هەرکام لەمانە بێت زۆر گرنگ نییە، ئیماندار دەتوانێ بە خاترجەمی لەسەر باوەڕ و عەقیدەی خۆی بەردەوام بێت بەو مانایەی کە باوەرت بە رۆژی دوای هەبێ، هیچ زیانێك بە عەقیدە و باوەڕەکەت ناگات. یان ئەگەر باوەرت بە بوونی خوا هەبێ هیچ زیانێکی پێ ناگات. واتە هەموو ئەو روداوانەی دەیانگوت بە هۆی روحەوە روودەدات دەکرێ بڵێی هەر لە وجودی مادیی ئادەمیزاد روو دەدات. من ئەم سێ چەمکەم لە سەرەتای باسەکەمان هێنا بۆ ئەوەی کە ئەو شتەی لەگەڵ غەیب پەیوەندی هەیە، باسم کردبێ. هەڵبەت لە سەرووی بابەتی غەیبی، خوداوەند هەیە، کە دووبارە لەبەر ئەو هۆکارانەی باسم کرد، هیچ دۆزینەوەیەکی زانستی ناتوانێ ناکۆك بێت لەبەرامبەر بوونی خودا، هەڵبەت ناتوانێ بیشیسەلمێنێ.

منیش هەر پێم وایە بەڵگەی رێکوپێکی جیهان یان"برهان نظم" کە جیهان ڕێکخەرێکی هەیە و هەر لەبەرئەوەشە ئاوا نەزم و ڕێکی لە جیهاندا هەیە، ئەم بەڵگەیە بە هیچ جۆرێك بەڵگەیەکی پتەو کافی نییە. کێشەی زۆر دێتە ناو باسەکە، هەروەها پێویستیشی بە داروین نەدەکرد کە ئەو پێمان بڵێ، لەبەرئەوەی لە روانگەی فەلسەفی بەوە گەیشتبووین و زانایانی پێشتریش ئەم خاڵەیان باس کردووە. بۆیە ئەم بەڵگەیە لاوازە و تەنیا عادەتی زەینی خەڵکی ئاساییە. لەوانەیە قەناعەت بەوان بهێنێت، هەروەکوو ئەو چیرۆکەی کە هەڵبەستراویشە، دەگێڕنەوە کە پێغمبەر(د.خ) لەگەڵ هاوەڵەکانی بە شوێنێکدا تێدەپەرین، پیرێژنێکیان بینی کە چەرخێکی پێ بوو و سەرقاڵی خوری رستن بوو. لێیان پرسی تۆ خودات چۆن ناسیوە، ئەویش دەستی لە سوڕاندنی چەرخەکە هەڵگرت و چەرخ راوەستا، گوتی ئەم چەرخە بۆ هەڵسوڕاندنی پیویستی بەمن هەیە کەوابوو ئەم گەردونەش بۆ هەڵسوڕاندنی پێویستی بە خودا هەیە. ئەم جۆرە باوەڕەی پیریژنە ناوی لێنرا بوو "دینی پێرێژنان". یەکەم: ئەم چیرۆکە هەلبەستراوە و شتی وا رووی نەداوە، دووەهەم: ئەم پیرێژنە لە کوێرا دەیزانی ئەفلاك هەڵدەسوڕێن یان زەوی

دەسورێ؟ دواتر ناچار بوون راڤەکاری بۆ ئەمە بکەن. مەولانا لەم بارەوە رونکردنەوەی داوە. هەڵبەت ئەمە لە بنەرەتدا راست نییە پیویست بە ڕاڤەکاریش ناکات.

ئەم بەڵگەی نەزم و رێکو پێکێیەی کە لەم جیهانەدا هەیە هەتا" antropic principle" کە لەم ئەخیرانە هەندێك لە شارەزایانی بواری فیزیا ئاماژەیان بۆ کردووە و پشتی پێ دەبەستن کە شێوەیەکی پاڵێوراوی بەڵگەی نەزمە و لەسەر بنەمای دەستکەوتە نوێیەکانی فیزیایە، بە بڕوای من هیچ کام لەمانە ئەوەندە بەهێز نین. ئەمانە بەهێزترین بەڵگەیان ئەوەیە کە ئەم جیهانە بەم نەزمە بێ وێنەیە ئەگەری روودانی بە بێ هۆکار"علت" زۆر زۆر کەمە. ئەمە وتەی کۆتایی "برهان نظم"ی جیهانە لە هەمان کاتدا نکۆڵی کردن لە موعجیزاتیش هەر لەسەر ئەم بنەمایەیە و سەرچاوەکەیان هەر یەکە.

تەنیا وتەیەك کە بتوانرێ لەبەرامبەر ئەوانەدا بگوترێ ئەوەیە کە: رووداوگەلێك بە ئەگەرێکی زۆر زۆر کەم دەکرێ روبدەن، رووداوێك کە ئەگەری روودانی کەمە بە مانای مەحاڵ بوون نییە. هەروەکوو گوتم زانستەکان هیچ کاتێك مەحاڵ بوونی شتێك ناسەلمێنن. تۆ بیسەلمێنە ئەگەری روودانی شتێك بۆنموونە"(ملیارد100=)^1"، ئەم ژمارەیە ئیتر لە مێشك و خەیاڵی کەسدا ناگونجێ، واتە ئەگەری روودانی زۆر کەمە، بەڵام بەو مانایە نییە کە ناتوانێ رووبدات. هەر لەبەر هەندێ دەکرێ بگوترێ ئەگەری دروست بوونی منداڵێك بە بێ باوك زۆر کەمە، بەڵام شتانێك بە ئەگەری کەم دەکرێ رووبدەن. نمونەیەکی سادە دەهێنمەوە و ئیتر لەم باسە تێدەپەڕین: وادابنێ تیروپشکێك دەکرێ لە نیوان سەد ملیۆن کەس خەڵاتێك بەر یەك کەس دەکەوێ، لەبەرئەوە ئەگەری ئەوەی کە ئەم خەڵاتە بدرێت بە هەرکام لەمانە،"ملیۆنە1/100"ە، کە ئەگەرێکی زۆر کەمە، بەڵام بێگومان لە کۆتاییدا بەر کەسێکیان دەکەوێ. کەوابوو رووداوێك بە ئەگەرێکی بەم کەمییە هەر بۆی هەیە رووبدات. ئەگەری کەم هەرگیز بەمانای روونەدان نییە، بە مانای مەحاڵ بوون نییە، تەنیا بەمانای دەگمەن بوون دێت.

هەندێکی دیکە پێیان وایە لە دوای هاتن و پەسەند کردنی بیردۆزی پەرەسەندن بەڵگەی نەزم ئەگەری بەهێزتر بووە لە جیاتی ئەوەی بەرەو لاوازبوون بڕوات. ئێستا ئێمە وا دادەنێین کە بیرۆدزی پەرەسندنمان قەبوڵ نییە و وەکوو پێش سەدەی نۆزدەیەم بەو جۆرەی پێشتر بیردەکەینەوە: کتێبێك هەیە نووسەرەکەی "لۆکۆن

**دونوی"زانایەکی فەرانسییە، هەموو بەڵگەهێنانەوەکانی ئەو لەو کتێبەدا ئەوەیە کە پەیدابوونی یەك گەردی پرۆتین چەندە ئەگەری دروستبوونی کەمە، یەکەم: ئەم ئەژمارکردنە خۆی کێشەی هەیە، پەیدا بوونی پرۆتین لە فەزای تایبەتیدا دروست دەبێ، دووەم بە"تەدریج" واتە بەرەبەرە دروست دەبێ نەك بە یەکجار، ئەوان هەمیشە ئەگەری دروست بوونی لە پرڕای شتەکان ئەژمار دەکەن، زۆرچاکە لەگەڵ هەموو ئەم وەسفانە پەیدا بوونی گەردێکی پرۆتین ئەگەری دروست بوونی زۆر کەمە، بەڵام لە هیچ شوێنێك نەگوتراوە روداوێکی بەم ئەگەری کەمە ناکرێ روویدات.**

**کتێبێکی نایاب هەیە بە ناوی "قووی ڕەش"، چەند ساڵ لەمەوبەر لە ئەمریکا چاپ کرا، یەکێك بووە لە پڕفرۆشترین کتێبەکان. هەموو بەڵگەکانی ئەو ئەوەبوو کە ئەگەری دروست بوونی قووی ڕەش هەیە ( بە شێوەی گشتی زیاتر قووەکان ڕەنگیان سپییە). روونکردنەوەی ئەو لە کتێبەکەیدا ئەوەبوو کە زۆربەی رووداوەکانی ئەم دونیایە بەهۆی رووداوە دەگمەنەکانەوە پێکهاتووە. رووداوەکان بە ئەگەری زۆر، کەمترن. رووداوگەلێك کە ئەگەری روودانیان کەم بووە، لەناکاو سەریان هەڵداوە و پێکهاتەی ئەم جیهانەیان پێکهێناوە. بۆنمونە جەنگی جیهانی دووەم ئەگەری روودانی زۆر کەم بوو. دەتوانی نوسینەکانی ئەو کەسانە بخوێنیەوە کە بەر لە جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم نوسراون، لەوانە "برتراند راسل"، دەلێن بە ئەندازەیەك دونیا ئارام بووە کە کەسانێك لەو سەردەمە نەژیابن ناتوانن بزانن. لە ناکاو بارودۆخەکە تەقییەوە وئەو جەنگانە روویدا. لە مەودای جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم تێوری "نەفی علییەت" هاتە ناو بازاری زانستەوە. نامیلکەیەك هەبوو کە لە ئینگلستان نوسرا، نوسەرەکەی ناوی "فورمان" بوو، ئەو کاتەی من لەوێ خوێنکاربووم ئەوەم خوێندەوە، قسەی ئەو ئەوەبوو کە: یەکێك لە هۆکارەکانی سەرهەڵدانی"دەترمینیزم" واتە نەفی علییەت روودانی ئەم دوو جەنگە بوو، کەس بیری بۆی نەدەچوو شتێکی وا روویدات. لەبەرئەوە هاتن و گوتیان ئەم جیهانە "علییەت"ێکی زۆر پتەوی نییە، هاتن و گوتیان شتێك هەروا بە رێکەوت دەکرێ روویدات. من ناڵێم کە هاوڕام لە گەڵ ئەم قسانە، دەمهەوێ بڵێم روداو بە ئەگەری کەم، روودەدەن، بەڵام دەگمەنن.**

گەیشتینە ئەو خاڵەی کە هیچ شتێك لەزانستدا نییە کە بیهەوێ بوونی خودا بسەلمێنێ یان نکۆڵی لە بوونی خودا بکات. لەم رووەوە زانست بێ لایەنە. شتێك هەیە لەم جیهانە کە زۆریش گرنگە، زانایەك بە ناوی "ئییەن باربور" نزیکەی پەنجا ساڵ لەمەوبەر کتێبێکی نووسی بە ناوی "بابەتەکانی زانست و ئایین" من ئەم کتێبەم برد بۆ ئێران و تەرجەمە کرا، لەوێدا ئەو نووسەرە دەستەواژەیەك بەکاردەبات بە ناوی"God of gaps" یان "خودای درزگیر" بە فارسی بە "خدای رخنە پوش" تەرجەمە کراوە، ئەم خودایە زۆر ترسناکە، دەبێ خۆی لێ بە دوور بگرین، واتە لە هەرکوێیەك کە لە رونکردنەوەی زانستیانەی شتێك دەستەوەستان بووی، ئەوکات ئەم خودایە بهێنیتە ناو بابەتەکە، ئەمە پێی دەڵێن خودای درزگیر، کە زۆر هەڵەیە. ئەمە نەك هەر یارمەتی خودناسی نادات بەڵکو شێوەیەکی سەد لە سەد دژ بەخواناسیە. دەبێ سروشت بە سروشت روونبکرێتەوە، نابێ سروشت بە هۆی سەروسروشت روونبکرێتەوە و ناشتوانی. ئەمە لەو هەڵە گەورانەیە کە روویداوە. ئێمە لەژێر رۆشنایی پێشکەوتنەکانی زانست و فەلسەفە خودامان لەم بیرۆکە هەڵەیە رزگار کردووە. ئەمە هەڵەیە کاتێك تۆ زانیاریی ئەزمونیت بە شتێك نەگات، لەوێدا بڵێی کەوابوو ئەمە خودا ئەم کارە ئەنجام دەدات. بۆنموونە من کاتێك نازانم باران چۆن دەبارێ، کەوابوو ئەوە خودا دەینرێ. من نازانم کەسێك چۆن دەمرێ دەڵێین ئەوە خودا مراندی. ...هتد. ئەمە پێی دەڵێن "Gode of gaps" واتە ئەو خودایە کە درزەکانی زانیاری تۆ پڕدەکاتەوە. شتێك کە تۆ خۆت نایزانی یان هێشتا زانست کەشفی نەکردووە، لەجیاتی ئەوە تۆ خودا دەهێنیتە کایەوە، ئەم خودایە سەرەنجامی زۆر رۆشنە، بە هۆی بەرەوپێش چوونی زانست پاشەکشە دەکات، واتە هەرکاتێك هۆکار یان هۆکارەکانی زانستی کەشف ببن تۆ ناچار دەبی خودا بخەیتە ئەولاوە. هەر بەم جۆرە بەرووپێش دەڕوا تا دەگەینە ئەو ئەندازیارە خانەنشینکراوە، واتە پێی دەڵێن رێزی تۆ لە جێگای خۆی، بەلاّم ئیتر هیچ لە دەست تۆدا نییە، کاروبارەکان هێزەکانی سروشت ئەنجامی دەدەن و بەدەستیان گرتووە.

ببینە، ئەگەر خودایەك بوونی هەیە، ئەوا لە ئاستێکی بەرزتر بوونی هەیە. لە ناو زەمینە یان پانتایی هۆکارەکانی سروشتدا نییە. هۆکارێك نییە لە هۆکارەکانی سروشت کە بڵێی خوداوەند لەوێدا بەو جۆرە کاردەکات. ئەگەر هەیە لە ئاستێکی دیکەدا چاوەدێری و دەسەلاّتی بەسەر ئەم دونیایەدا هەیە. سروشت کاری خۆی بەڕێوەدەبا. هەندێك لە یەهودییەکانی مودێرن لە تەفسیری ئایەتەکانی سەرەتای سفری "وەدیهاتن" کە دەڵێ خوداوەند جیهانی لە

شەش رۆژ دروست کرد و لە رۆژی حەوتەم پشوویدا، لەو تەفسیرانەدا دەڵێن مەبەست ئەوە نییە کە خودا ماندوو بوو و دواتر پشووی دا، هەڵبەت هەندێکیان وا دەڵێن، بەڵکو کاری جیهانی دایە دەست خودی جیهان، گوتی: لەمە بەدواوە هیزەکانی سروشت گۆڕانکارییەکانی سروشت دەگرنە دەست و پێویستی بە بەشداری راستەوخۆی من نییە. ئەمە زۆر وتەیەکی گرنگە، هەڵبەت فیلسوفانی ئیسلامیش ئەم قسەیەیان کردووە، کە جیهان خۆی خۆی بەرێوەدەبا. ئەگەر گیایەك دەڕوێ، یان ئەگەر باران دەبارێ، ئەگەر منداڵێك دێتە دونیاوە، ئەگەر کەسێك دەمرێ، ئەگەر کەسێك نەخۆش دەکەوێ یان ئەگەر چاك دەبێتەوە، هەموو ئەمانە هێزەکانی سروشت ئیدارەی دەکەن. ئێستا لەوانەیە بپرسی، باشە کە دەڵێی دۆعا گیرا دەبێ لەم جیهانە، ئەی ئەمەچییە؟ ئەی موعجیزە چی؟ سرنج بدە، موعجیزاتیش هەمان ئەم هێزانەن کە خودا لەم دونیایەدا گونجاندونی، بەڵام من گوتم لەوانەیە ئێمە هەندێك لەو هێزانەمان نەناسیبێ، ئەم جیهانە یەك جیهانی مومکینە نەك تەنیا جیهانی مومکین. زانست مەرجی کافی دەخاتە روو، نەك مەرجی لازم. کەوابوو هەر لەم سروشتەدا، مەبەستم لە سروشت ئەم جیهانە دروستکراوەی خودایە، کە هەموو جۆرە هێزێکی تێدایە، لەوانەیە تۆ هێزی دەرونیت هەبێ، من چۆنییەتیەکەی نازانم، بەڵام لەوانەیە بتوانی مێشکی من بخوێنییەوە، ئەمە هیچ کێشەیەکی تێدا نییە و ئەگەری رووادنیشی زۆرە، بەڵام ئەوەی کە بیر بکەیەوە لە شوێنێك خودا راستەوخۆ دێت و بەشداری دەکات، نا. ئەمە هەڵەیە، خوداوەند هێزێك نییە لە هێزەکانی سروشت، لە پانتایی دروستکراوەکانی خۆی کار ناکات، بەڵکو لەبەرزی یاخود لەسەرووی دروستکراوەکانی خۆی کار دەکات. خودایەکی لەم جۆرە دەستی هێزەکانی سروشتی ناگاتێ. و لەبەر ئەوە زانست ناتوانێ پوچەڵی بکاتەوە یان بیسەلمێنێ، بۆ گەیشتن بە ئەو دەبێ رێگەی دیکە بگرینە بەر، یان لە رێگەی فەلسەفەی مێتافیزیك یان لە رێگای شهود"بینایی" و عیرفان کە لە دەروەی بابەتەکەی ئێمەیە.

ئەوەی کە بووە هۆی مشتومڕی نێوان زانست و ئایین خودای درزگیر بوو. خودایەك کە دەهات بۆ ئەوەی جێگای هێزەکانی سروشت بگرێتەوە، هەڵبەتە کە زانست ئەم خودایە لە گۆرەپانەکە دوور دەخاتەوە، بەڵام نەك هەموو خودایەك، نەك هەموو تێ گەیشتنێك بۆ خودا. خودا لە سەرووی ئەم هێزانەوەیە. هەروەك ئەم شیعرەی مەولانا کە دەڵێ:

گر سیل عالم پر شود هر موج چون اشتر شود

مرغان آبی را چه غم تا غم خورد مرغ هوا

**دەریا کاتێ شەپۆل دەدات، ئەوپەڕی ئاستی بەرزی شەپۆڵەکەی چەندەیە؟ ئەگەر باڵندەیەك لە بەرزییەکی زۆرەوە بفرێ، ئەم شەپۆڵانە نایگەنێ و ناتوانن کاریگەری بکەنە سەر ئەو باڵندەیە. راستە کاتێ ئێمە باوەرمان بە خودا هەیە، دەڵێین هەر شتێك لەم جیهانە روودەدا، لەژێر ویستی خودایە، بەڵام لەژێر ویست و ئیرادەی ئەو بەو مانایە نییە کە خودا بۆ خۆی دێ و وەکوو هێزەکانی سروشت رەفتار دەکات. ئەکەر وابوو ئەی بۆ هێزەکانی سروشتی لەم جیهانە وەدی هێناوە. هەموو شتێك تەگبیری نەخشەکێشراوی ئەوە بە بێ هیچ گومانێك.** " لا حول ولا قوة الا باللّه"**، لە هەمان کاتدا ئەو هیچ کات لە پانتایی هێزەکانی سروشت کارناکات و لە سەروو سروشتەوەیە و نادیارە لەم جیهانە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا بوونی هەیە. ئەمە ئیتر نهێنی بوونی خودایە. هەروەك "فروغی بەستامی" دەڵێ:**

کی رفتهای زدل که تمنا کنم تو را

کی بودهای نهفته که پیدا کنم تو را

غیبت نکردهای که شوم طالب حضور

پنهان نگشتهای که هویدا کنم تو را

با صد هزار جلوه برون آمدی که من

با صد هزار دیده تماشا کنم تو را

**کەوابوو نادیارێکی دیارە. هەموو بابەتە غەیبییەکان "پارادۆکسیکاڵ"ن، هەوەك سەعدیش دەڵێ**

هرگز وجود حاضر غایب شنیدهای

من در میان جمع و دلم جای دیگر است

**هەموو بابەتە غەیبییەکان "پارادۆکسیکاڵ"ن و تێکەڵ بە ڕاز بوونە. لە سەرووی هەموو ئەم ڕازانەش خودا هەیە."نور الانوار" و "سرالاسرار". لەبەرئەوە مەفهومەکانی زەینی ئێمە پێی ناگەن. بەڵێ، یەك جۆر خوداناسی هەیە کە لەگەڵ زانست تێکدەگیرێ، بەڵام نەك هەموو خوداناسییەك. ئێمە دەرك و تێ گەیشتنێکمان بۆ خودا هەیە، کە دەتوانرێ ناوی بنرێ " وحدت الوجود" دەرکێك کە خودا هەم بوونی هەیە لەم جیهانە هەم نادیاریشە، لە چاوی ئێمە نادیارە. نادیارە لە مەفهومەکانی ناو مێشکی ئێمە، بەڵام لەهەمان کاتیشدا لە هەموو شوینێك ئامادەیی هەیە. ئەم جیهانە"تەجەلی" یا دەرکەوتنی ئەوە، واتە ئەگەر خودا بیویستایە دەربکەوتایە بەم شێوەیە دەردەکەوت، کە ئێستا دەرکەوتووە. لەبەرئەوە بۆ هەر شوێنێك  بنواڕی دەتوانی بیبینی، لە گوڵێکدا، لە روناکیدا، هەتا لە شەیتانیشدا دەیبینی، لە پێغمبەرانیش دەیبینی. واتە ئەوانە مەزهەری خوداوەندن، لەم روانگەوە یەکسانن.**

**عاریفەکان لێرەدا گەورەترین خزمەتیان  بە ئێمە کردووە کە ئەم خودایەیان پێ ناساندووین.**

**ئەگەر لەم باسە تێپەڕین و بچینە ناو دەقەکانی کتیبی پیرۆز. هەروەك گوتم ئێمە مێژوو بە پێچەوانەوە دەپێوین. لەو جێگایەی ئەم تێکهەڵچونانە زیادی کردو سەرەتایەکی سەخت و قورسی هەبووە، لەوێ بوو کە دۆزینەوە زانستیەکان لەگەڵ تەورات ناکۆکی هەبووە، لە هەمان کاتدا ئەمانە قورئانیش دەگرێتەوە. من لێرەدا دێم کەمێك لە سەر قورئان دەدوێم. نابێ دڵمان بەوە خۆش بکەین کە ئەم مشتومڕانەی زانست تەنیا لەگەڵ کتێبە پیرۆزەکانی پێشترە و پەیوەندی بە ئێمەوە نییە. خاڵی یەکەم: پەیوەندی بە ئێمەشەوە هەیە، خاڵی دووەم: گریمان کە پەیوەندی بە ئێمەوە نەبێ، دیسان هەر نابێ پشتگوێ بخرێن، چونکە ئەوانەش بەشێکن لە مێژووی ئایین. ئێمە لەم بابەتە دەبێ هەموو ئایینەکانی دیکەش لەبەرچاو بگرین. کەوابوو ئەم مشتومڕە وەکوو ئاگری ژێرخۆڵەمێشە و هێشتا بوونی هەیە، و ئەم ئاگرە سەر وەدەردەنێ.**

**قورئان بە "رواڵەت" باس لە خودایەك دەکا کە خودای درزگیرە، واتە راستەوخۆ دێتە ناو هێزەکانی سروشت و کاری سروشت ئەنجام دەدات، لە شوێنێکدا دەفەرموێ:** " الله يتوفي الأنفس حين موتها"**. زۆر بە ئاشکرا لە شوێنێکی دیکە دەفەرمێ خودا باران دەبارێنێ:** " انزلنا من السماء ماء طهورا" **. لە جێگایەکی دیکە دەفەرموێ ئێمە با دەنێرین:** " ارسلنا عليهم ريحا صرصرا"**. ئەمانە بۆ هەندێك لە موتکەلیمە موسڵمانەکان  ئەو گومانەی**

**دروست کردبوو کە "ئەم کارانە خودا ئەنجامیان دەدات و هێزەکانی سروشت هیچیان لەدەستدا نییە، لە راستیدا جیهان راستەوخو لە لایەن خوداوە هەڵدەسوڕێ. " هەڵبەتە بە تێگەیشتن و دەرکێکی لەم جۆرە لە نیوان پەیوەندی خودا و جیهان، ئەوکات لەگەڵ زانست دەکەوینە کێشەوە.**

**ئێستا دەمهەوێ لێرەدا یاسایەکتان فێرکەم کە زۆر بابەتێکی گرنگە، بەڵام پێش ئەوە شتێك بڵێم، لەوانەیە ئێستا ئەم بابەتەی باسی دەکەم لای زۆرێکتان قەبوڵ کراو نەبێ بەتایبەت پەیوەندی نێوان پێغەمبەر و قورئان، بەهەر حاڵ من ناچارم هەموو ئەم شتانە باس بکەم، چونکە من لە نوسینەکانی خۆمدا باسم کردوون و بەڵگەم بۆ هێناونەتەوە و دەکرێ گفتوگۆیان لەسەر بکرێ. بزانە ئەو پەیوەندییەی کە وەحی یان کەلامی خودا لەگەڵ پێغەمبەر هەیبووە، جیاوازە لەو پەیوەندییەی کە لەگەڵ ئێمەدا هەیەتی. قورئان لەگەڵ پێغەمبەر پەیوەندییەکی هەبوو کە خاوەنی وەحی بوو، و لەگەڵ ئێمە کە گوێگرین بۆ وەحی، پیوەندییەکی جیاوازتری هەیە. پێغەمبەر هەموو شتێکی ئەم جیهانەی لە خوداوە دەبینی، واتە نەیدەتوانی بە جۆرێکی دیکە شتەکان ببینێ. چاوێکی بۆ کرابوویەوە، کە زۆر زۆر گرنگە، ئەمە هەمان چاوی یەکتاپەرەستیە" تەوحید" هەمان کل(سورمەی) یەکتاپەرەستیە کە لەچاوی دراوە. مەولانا دەڵێ:**

عارفان را سرمەای هست آن بجوی

تا کە دریا گردد این چشم چو جوی

**کلی یەکتاپەرەستی لە چاوی درابوو، لەراستیدا نەیدەتوانی شتەکان لەدەستی خودا نەبینێ. ئەم جیهانە خوا پڕی کردبوو. هەموو کارێك خودا ئەنجامی دەدا. گیایەك کە دەڕوێ، باران کە دەبارێ، لە هەر دڵۆپێکی باران و لە هەر گەڵایەکدا خودا بوونی هەبووە. چی لە بەهار و ژیانەوە، چی لە پاییز و خەزان. کەسێك مردبا یان لە دایك بووبا. ئەو نەیدەتوانی جگە لەمە قسە بکات. کاتێ قسەی دەکرد وەکوو عاشقێك بوو، مەولانا وتەنی:**

آن زلیخا از سپندان تا بە عود

نام جملە چیز یوسف کردە بود

**زلێخا کاتێ قسەی دەکرد ناوی هەموو شتێکی نابوو یوسف. لە هەموو شتێکدا یوسفی دەبینی. ئەم چاوە ئاشقانەی ئەو جگە لە یوسف هیچی دیکەی نەدەبینی. باشە من کە زلێخا نیم و ئاشق بە یوسف نەبم، هەڵبەتە کە ناتوانم ئەو پەیوەندییەم هەبێ. ئەوە ئەوبوو کە بەم جۆرە دەیبینی و قسەی دەکرد. کەسێك نغرۆ بووبێ، جگە لەمە چاوەروانی لێ ناکرێ. لەبەر ئەمەیە کە دەڵێین یەکتا پەرەستی سەرەکی ترین پەیامی پێغەمبەرانە و سەرەکیترین ئەزمونی پێغەمبەرانە، تێبینی زیاترم لەسەر ئەزموونی پێغەمبەرانە کە زۆر گرینگە. سەعدی دەڵێ:**

دیگران را تلخ می‌آید شراب جور عشق

ما ز دست دوست می‌گیریم و شکر می‌شود

**هەموو شتێك لە"دوست" وەردەگرێ. لە دەستی کەسێك یان شتێکی دیکە جگە لە خودا وەرناگرێ. لەوێدا هێزەکانی سروشت وون ببون و نەدەبینران. نەك ئەوەی نەکۆڵی بکرێ، بەڵکو نەدبینران. وەك ئەوەی خودا هەموو شتێکی پڕ کردبێ. ئەم تەجرەبەیە یاخود ئەزمونە عاریفەکانیش هەیانبووە. هەمیشەش پێیان دەڵێین "راز الود" یاخود تێکەڵ بە ڕاز بوونە. ناتونین بڵێین چی بوو، بەڵام بە شێوەیەك ئەم جیهانە پڕ لە خودایە کە هەموو شتەکانی دیکە بە هۆی تیشکدانەوەی ئەو، ڕوخسار و ڕەنگ وەردەگرن، بەڵام کاتێك ئادەمیزاد بە ئاگابێتەو واتە لەو تەجرەبەیە بێتە دەرێ، هەموو شتێك لە شوێنی خۆیەتی و هەر بونەوەرێك یاسای و رەنگ و قەبارەی خۆی هەیە. ئێمە ئەو پەیوەندیەمان هەیە.**

**یاساکەی گوتم ئەمەیە: کاتێك قورئان دەخوێنییەوە، لە هەر شوێنێك کە دەفەرموێ خودا ئەو کارەی کرد تۆ بە شێوازی نادیار بیری لێبکەوە، بەم جۆرە: خوداوەند گیانی کەسێکی ئەستاند، تۆ بەم جۆرە بیری لێ بکەوە فلان کەس مرد. ئەوە پێغەمبەر بوو دەیتوانی بڵێ خودا گیانی فلان کەسی ئەستاند، لەبەر ئەوەی ئەو خۆی دەیبینی. خودا بای نارد، بەم جۆرە بیری لێ بکەوە، بای دێت.....هتد. هەر دووکیان راستن، بەڵام ئەو کەسەی هەموو شتێکی جیهانی لە ژێر کۆنترۆڵی خودا دەبینی، ئەو لە هەموو شوێنێك باسی لە خودا دەکرد بە بێ هیچ جیاکردنەوەیەك "استثنا"، نەك تەنیا لەو شوێنەی زانست ناتوانێ وەڵام گۆ بێت. خاڵی جیاکرەوەی لەگەڵ خودای درزگیر ئا ئەمەیە. بەڵکوو لە هەموو شوێنێك خودا بوو کارەکانی ئەنجام دەدا لە مەرگ و لە دایك بوون خێر و شەر. لەقورئان هەیە**

**کە دەفەرموێ شەڕیش هەر لە خوداوەیە،** "قل أعوذ برب الفلق 1 من شرماخلق2": **نکۆڵی لەمانە ناکات، "بڵێ پەنا بۆ ئەو خودایە دەبەم کە شەڕی دروست کردووە. ئەمە ئەوپەڕی لوتکەی یەکتاپەرەستیە کە پێغەمبەر هەیبووە. ئەو ئەم پەیوەندیە یەکگرتووییەی نیوان خودا و جیهانی بەم شێوەیە دەبینی، بەڵام بۆ ئێمە، ئەگەر ئەو چاوە کراوەمان هەبوو ئەو خۆش بەحاڵمان، بەڵام ئەگەر چاوێکی لەو جۆرەمان نیە بۆ روانینی ئەو جۆرە یەکتاپەرەستیە، ئەوا دەبێ لە کاتی خوێندنەوەی ئایەتەکانی قورئان ئاگادار بین بزانین کە چۆن دەیخوێنینەوە.**
" ألم تر أن الله يسبح له من في السماوات و الأرض" **ئەو لەبەرئەوەی هەموو شتێکی لە خواوە دەبینی، هەتا وێردی بونەوەرانی دیکەی بیستووە. مەولانا دەڵێ:**

فاش تسبيح جمادات آيدت

وسوسة تاويلها نربايدت

**ئەسڵەن پێویست بە راڤەکاری ناکات. رێك شتەکان بە راستەوخۆی روودەدەن.**

فلسفی کو منکر حنانه است

از حواس اولیا بیگانه است

**ئەو هەستێکی هەبوو کە دەنگی تەسبیحاتی دەبیست. پەیوەندی ئەمانەی لەگەڵ خودا دەبینی و تەجرەبەی دەکردن. ئەم کتێبە "قورئان" پڕە لەم پەیوەندییانە. چوونە ناو رۆح و ناوەڕۆکی ئەم کتێب وا لە ئادەمیزاد دەکات کە لەگەڵ حەقیقەتی جیهان ببن بە یەك، چاوێکی پێغەمبەرانە دەدات بە ئادەمیزاد، یان چاوێکی عاریفانە، بەڵام کاتێ ئێمە دەیخوێنینەوە نابێ دووچاری هەڵە بین. مەولانا لە سەرەتای دەفتەری دووەم دەڵێ:**

نامصور یا مصور گفتنت

باطل آمد بی ز صورت رفتنت

ای بسا کس را که صورت راه زد

قصد صورت کرد و بر الله زد

**هەندێك خەڵك لەگەڵ یەكتر مشتومڕ دەكەن كە خودا "صورت" روخساری هەیە یان نا. دەڵێ ئەوەی كە دەڵێ روخساری نییە دەبێ بۆخۆشی لە روخساری چوبێتە دەرێ تا بتوانێ ئەو قسەیە بكات. لەبەرئەوە  ئێمە لەناو جیهانی روخسارداین هەمیشە قسە لە روخسارەكان دەكەین هەتا ئەگەر بە رواڵەتیش لە بێ روخساری خودا قسە بكەین، مانا راستەقینەكەمان لێوە دیار نییە.**

**ئەگەر لەمە تێپەرین هەرچەند هێشتا بابەتەكە تەواو نەبووە. لە قورئان هەندێك شت باس كراوە كە بە "رواڵەت" لەگەڵ زانست ناكۆكە، بۆ نموونە** "حَتَّىٰ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ الشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ

**من ناڵێم ئەمانە تەفسیر نەكراون، من تەنیا رواڵەتی ئایەتەكان باس دەكەم.  یان حەوت ئاسمان، كە هەموو ئەوانەی تەفسیری قورئانیان كردووە، هەمان حەوت ئاسمانی "بەتلیمۆسیان" باس كردووە. واتە هەر ئەو بۆچونانەیان  بۆ هەسارە و خۆر و زەوی هەبووە كە تا بەر لە كۆپەرنیك باو بووە. یان بۆ نموونە لە بارەی ئادەمیزاد كە دەفەرموێ:** "خلق من ماء دافق يخرج من بين الصلب و الترائب" **بینیومە زۆریك لەوانەی ئەمرۆ تەفسیری قورئان دەكەن، كاتێ دەگەنە ئەم ئایەتانە كێشەیان بۆ پێش دێت و هەوڵ دەدەن راڤەی بۆ بكەن. یان بۆنموونە لە بواری جن، لە سورەتی البقره كەسانێك كە سووخۆرن وەكوو ئەوەی جن دەستی لێ وەشاندبن: "**ألذين يأكلون الربا لا يقومون الا كما يقوم الذي يتخبة الشيطان من المس". **چی لەبارەی ئەمانەوە دەتوانرێ بگوترێ؟ ئەم بابەتەی دەست وەشاندنی جن كە باسم كرد، یەكێك لە لەوانەی تەفسیری قورئانی كردووە بە ناوی "زەمخشەری" لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا نووسیویەتی كە قورئان لێرەدا لە زاری بیروباوەڕی خودی عەرەبەكانەوە قسەی كردووە، ئەوان پێیان وابووە كاتێك جن دەچێتە لەشی كەسێكەوە هاوسەنگی لە دەست دەدا. ئەمەش رێگە چارەیەكە. ئەویش ئەوكاتە هەستی بەوە كردبوو كە ئەم قسەیە لەوانەیە لە روانگەی زانستی و فەلسەفی سەردەمی خۆی پەسەند نەبێ مەولانا لێرەشدا باسی ئەم قسەیەی "زەمخشەری" كردووە:**

فلسفی مر دیو را منکر شود

در همان دم سخرۀ دیوی بود

**دەڵێ مەگەر بۆخۆی جنی گرتووە کە دەڵێ جن بوونی نییە؟ هەڵبەتە هەن لە زانایان کە بابەتی زانستیان لە قورئان هەڵێنجاوە، من ناتوانم لەگەڵ ئەم کارە هاوڕا بم. لەو حاڵەتدا دەبێ چی بکەین کە هەست دەکەین ئایین لەگەڵ زانستی سەردەم ناکۆکی هەیە؟ من ڕای خۆم زۆر بە ئاشکرا گوتوە، ئێمە دەبێ چاوەڕوانییەکانمان لە ئایین ڕاست بکەینەوە، هەروەها دەبێ چاوەڕوانیەکانمان لە ناسینی خودی پێغەمبەریش ڕاست بکەینەوە. چاوەڕوانی زۆرترین ڕادە (ماکزیمۆم) لە ئایین، لەناوچوونە. واتە چاوەڕاونیکردنی هەموو شتێك لە ئایین و بەڕاست زانینی هەموو ئەوشتانەی بە ناوی پێغمبەر و ئیمامەکان بۆیان گێراوینەتەوە، ئەمانە بە بروای من ڕاست نین. هەڵبەت ئەم باوەرانە لە زەین یان مێشکی ئیماندارن جێگای گرتووە و لادانیشی زۆر ئەستەمە.**

**ڕاستکردنەوەی تێروانینەکانمان بۆ ئایین و پێغمبەر هیچ زیانێك بە ئەرکانە ئایینیەکان ناگەیەنێ. باوەڕە بنچینەییەکانی وەکوو باوەڕ بوون بە خوداو ڕۆژی دوایی و ئەو شتانە لە جێگای خۆیان دەمێننەوە، بەلام ئەگەر پێغەمبەرێك ئەستێرەناس نەبوو یان پزیشك نەبوو یاخود لە بواری پزیشکی بێ ئاگا بوو، ئەوکات ئەگەر بۆشاییەك دروست بوو لە وتەکانی بەرامبەر فیزیۆلۆژی یان ئەستیرەناسی، ئەمانە هیچ زیانێك بە پێغەمبەرایەتی ئەو ناگەیەنێ. دەبێ خۆ بەدوور بگرین لەوەی کە پێغەمبەران تەواو کامڵ بوونە و هەموو شتێکیان زانیوە. پێغەمبەر بە ئاشکرا دەیگوت کە من مرۆڤێکم وەکوو ئێوە:** "قل انما أنا بشر مثلکم یوحی"، **لەبەرئەوە نابێ "مرۆڤ بوون"ی پێغەمبەرمان لە بیربچێتەوە. نابێ بیرمان بچێتەوە کە ئەو مرۆڤ بوو وەحی بۆ دەهات، بۆیە هەموو تایبەتمەندییەکی مرۆڤ بوونی تێدابووە و ئەم تایبەتمەندیانەش لە کتێبەکەیدا دەردەکەوێ و خۆی نیشان دەدا. هەر وەکوو گوتم دەزانم ئەم قسانەی من بۆ هەندێ کەس زۆر قورسن و پەسەندکراو نین، بەڵام دەکرێ گفتوگۆیان لەسەر بکرێ. لەم سەردەمەی ئێمە ڕێگا چارەسەرێکی دیکەمان بۆ مشتومری نێوان ئەقل وەحی نییە، جگە لەوەی بازنەی چاوەروانییەکانمان لە ئایین و پێغەمبەران سنوردار بکەین. زیاتر تەرکیز لەسەر ئایینێکی کەمترین ڕادە (مینیموم) بکەینەوە. نابێ بۆ ئایەتەکان بەشوێن ڕاڤەکارییەوە بین و بەهانەیان بۆ بهێنینەوە. ئەم کارە یەهودییەکانیش لەگەڵ تەورات کردیان، بەڵام هەوڵێکی بێ سوود بوو. یاخود نابێ بەدوای ئەوەوە بین کە بابەتە زانستیەکان لە قورئان دەربهێنین. ئەم کارە کەسانی دیکەش کردویانە و بێ سوود بووە. دەبێ بزانین ئێمە چیمان لە ئایین دەوێ. ئێمە چیمان کەم بووە کە شوێن پێغەمبەر کەوتووین. ئایا فیزیۆلۆژیمان کەم بوو؟**

**ئەستێرەناسیمان کەم بووە؟ پزیشکیمان کێشەی هەبووە کە بۆتە هۆی ئەوەی شوێن پێغەمبەر بکەوین؟ یان هۆکارێکی دیکەی هەیە؟**

**ئێمە دەتوانین نیازە زانستییەکانمان بەدەست بێنین ئەویش لە ڕێگای خوێندن و توێژینەوە، بەڵکو هیچ کات ئەم نیازانە نین کە وای لە ئێمە کردووە شوێن پێغەمبەران بکەوین. ئێمە دەتوانین بۆخومان خانوو دروست بکەین، بۆخۆمان بۆڕی کێشی بکەین و پێویستیەکانی دیکەی خۆمان جێبەجێ بکەین، نابێ بچین لە پێغەمبەران بپرسین کە ئەندازیاری و بۆری کێشی ... چۆنە؟ لەبەرئەوەی ئەمانە بەشێك نەبوونە لە روکنەکانی پەیامی هیچکام لە پێغەمبەران، هەروەها بەشێکیش نەبوونە لە پێویستیەکانی ئێمە بۆ خودا. ئێمە ئەگەر پێویستی لەم جۆرەمان هەبێ ناچین لە پێغەمبەران بپرسین و لە قورئانیش بەدوایدا ناگەڕێین و نابێ ئەو کارەش بکەین. ئەگەر وامان کرد، دیارە کە بە ڕێگەیەکی هەڵەدا رۆیشتووین، ئەم کتێبە و پێغەمبەریشمان بە هەڵە ناسیوە.**

**هەندێك لە ڕێبەرانی ئایینی ئەم چاوەڕاونییە زۆرترین ڕادیە یاخود"ماکسیمالیستەیان" لە ئاییندا جێگیر کردووە کە هەموو شتێکتان لە ئایین بوێ، لە راستیدا بەم جۆرە نییە. هەندێك پێیان وایە کاتێ خودا لە قورئان دەفەرموێ "**یوم اکملت لکم دینکم**" واتە هەموو شتێکی تێدایە، نەخێر. ئایین بۆ ڕێنمایی یاخود"هدایت" کامڵە. واتە لە چوارچێوە یان "فۆنکسیۆن"ی خۆی کامڵە نەك لە هەموو شتێك. من ئەگەر گوتم ئەم کتێبە بیرکاریە کامڵە واتە لە فێربوونی بیرکاری کامڵە نەوەك ئەوەی کە پزیشکیشی تێدا دەستکەوێ. ئایین کامڵە، بەڵام بۆ ڕێنمایی مرۆڤەکان، ڕێنمایی بۆ کامەرانی لە رۆژی دوای.**

**با بە شێوەیکی قەتعی بلێم: "ئەگەر نەمردباین و ژیانی دوای مردن بوونی نەبایە، ئەوا پێویستمان بە ئایین نەدەبوو." ئێمە کاری دونیای خۆمان بەڕێوە دەبرد، ئەو کۆمەڵگایانەی کە ئایینیان نیە یان پشتیان لە ئایین کردوە دەستەوەستان نەبوونە لە بەڕێوەبردنی کاروباری دونیایان. ئێمە پیویستمان بە ئایین نییە بۆ بەڕێوەبردنی دونیا، بەڵکو ئامانجی سەرەکی کامەرانیە لە رۆژی دوایی. ئایین لە بنەرەتدا بۆ ئاخیرەت هاتووە، نەك بۆ دونیا، بەلاّم لەبەرئەوەی ئێمە بەم دونیایەدا تێ دەپەڕێن، ئەوا نیمچە نیگایەکیش بۆ ئەم دونیایە دەکەین و گەرنا لە روانگەی ئایینەوە دونیا لە سێبەرە. مرۆڤەکان دەبێ دونیا بناسن و ئیدارەی بکەن و نابێ چاوەڕوانی ئەوەیان**

**هەبێ کە پێغەمبەران هونەری بەریوەبردن و یاساکانی زانست و نهێنیەکانی سروشتیان پێ بناسێنێ. ئێمە دەبێ چۆنیەتی گەیشتن  بە کامەرانی ئەو دونیا لە پێغەمبەران بپرسین. ئەوەی کە چی نیازێکمان هەیە بۆ گەیشتن بە خۆشبەختی ئەو دونیا. ئەمە خاڵی یەکەم.**

**خاڵی دووەم: ئێمە دەبێ لەگەڵ بەدیهێنەری ئەم جیهانە چی پەیوەندییەکمان هەبێ؟  ئەو خودایەی کە دروستکاری ئێمەیە و بەندەکانی خۆش دەوێ. ئا لێرەدایە کە چەمکی دۆعا و بابەتی پەرەستش رۆلی خۆیان دەبینین. فیقهی ئایینی کە زیاتر لە ئیسلام و یەهودییەت هەیە، توێکڵی ئایینە، واتە رووی دەرەوەی ئایینە. کاکڵ و ناوکی ئایین، ئەزموونی ئایینیە و هەروەها ئەزموونی یەکتاپەرەستیە کە باسم کرد، لە هەمان کاتدا ئاکاری جوان و موخلێسانەش. هەڵبەت ئایین پێشنارێکی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دونیاش کردووە، لە پەیوەندی مرۆڤەکان لەگەل یەکتر، چی لە کڕین و فرۆشتن و بواری کۆمەڵایەتی یاخود هەتا حکومەت کردنیش، بەڵام ڕێگەی زەروری نییە، بەڵکو یەکێکە لە ڕێگاکانی بەڕێوەبردنی کاروباری دونیا. ئەگەر کرا بەم ڕێگایە کاروباریی دونیامان بەڕێوەبەرین ئەوا ئەم ڕێگایە دەگرینە بەر، بەڵام ئەگەر ناکرێ دەبێ لێی گەڕێین. ئەو یاسایانە بۆ چارەسەکردنی کێشەکان هاتوون، ئەی ئەگەر خۆیان بۆنە هۆی کێشە، ئەوکات دەبێ وازیان لێ بهێندرێ و بەدوای رێگەچارەی دیکەو بین.**

**من ئەم بابەتانەم بەو پەڕی کورت و پوختی باسکرد. دڵنیام کە ئەگەر دینداریيەکی کەمترین ڕادە (مینیماڵ) بگریتە بەر و کاکڵی ئایین بناسی یاخود توێکڵ و کاکڵی ئایین بناسی، هاوکات ئەزموونی ئایینیش بکەیتە ناوەندی هەموو ئەمانە، ئەوا هیچ پێشڕەوییەکی زانستی و فەلسفەی ناتوانێ زیان بە باوەڕەکەت بگەیەنێ. ئەوکات مەست و حەیران لەدیار خودا دادەنیشی و خەمی هیچ کام لەم ئاڵوگۆڕانەت نابێ. لە هەمان کاتدا دەبێ سوودیش لەم گۆڕانکاریانە وەربگرین. قسەیەك هەیە کە دەگێڕنەوە کە بە "ڕاسڵ"یان گوتوە: "هەندێك خەلك دەترسن کتێبی زۆر بخوێننەوە، دەڵێن مێشکمان ئاڵۆز دەبێ." ئەویش گوتویەتی: "لەو کەسە مەترسن کە چەند کتێبێك دەخوێنێتەوە، بەڵکو لەوە بترسن کە تەنیا یەك کتێب دەخوێنێتەوە و لەسەر یەك سەرچاوە دەژی."  بۆیە دەڵێم سەرچاوەکانی بیری خۆتان زیاتر بکەن.**

**ئایین تا ماوەیەکی زۆریش تاکە سەرچاوە بووە. روحانیەت دامەزراوەیەکی تاک سەرچاوەیی بووە. تەنیا لە سەرچاوەکانی ناو خۆی دەڕوانی. دەبێ بازنەی سەرچاوەی زانیاریمان فراوانتر بکەین. هەروەك لەبەشی یەکەم گوتم؛ خودا هەم بەزمانی "زانست" قسەمان لەگەڵ دەکات هەم بە زمانی "فەلسەفە" و هەم بە زمانی "وەحی"یش، یەك زمان نەبووە، بگرە هێشتا زۆرێك لە قسەکانیشی نەکردووە، ئێمە دەبێ بچین کەشفیان بکەین و گوێ بیستیان بین، چی لە ڕێگای بینایی ("شهود) یان لە ڕێگەی بیرکردنەوەی ئەقڵی و یاخود لە ڕێگەی ئەزمونەوە. هەموو ئەمانە ڕێگان بۆ دۆزینەوەی نهێنیەکانی خودا. دەبێ گفتوگۆیەك لەنیوان دەرەوە و ناوەوەی ئایین دروست بێت. ئەم دوو ناوچەیە، دوو ناوچەی داخراو نین بەڕووی یەکتریدا، بەڵکۆ هەمیشە سەرڕێژ دەبن بەسەر یەکتردا. من لە کتێبی "**قبض و بسط**"دا باسم لەم خاڵە کردووە، کە زانیارییەکانی دەرەوەی ئایین لەگەڵ زانیارییەکانی ناوەوەی ئایین لەگەڵ یەکتر هەڵدەکەن واتە"تعامل"دەکەن و هەروەها سوود لە یەکتر وەردەگرن و لەگەڵ یەکتر گفتوگۆ دەکەن و وەڵامی پرسیارەکانی یەکتریش دەدەنەوە. ولانانی هەر کام لەمانە، بێ بەشمان دەکات لەم دیالۆگە ئەرێنی و بەسوودە. لەبەرئەوە دەبێ نرخی هەردووکیان بزانین و دەبێ سوود لە هەردولایان وەربگرین. هاوکات دەبێ سنوری هەردووکیشیان بزانیین، نابێ نە زانست و نە ئایینیش پێ لە بەرەی خۆیان زیاتر راکێشن. هەروەها نابێ هیچ کامیان خۆبەزل زان بن، چونکە ئەوکات لەگەڵ یەکتر دەکەونەجەنگەوە، بەڵام زانستێکی خاکی و ئایینێکی خاکی هیچ کات دووچاری جەنگ و مشتومڕ نابن و بە ئاشتی وئارامی لە تەنیشت یەکتر لەسەر کارەکانیان بەردەوام دەبن.**

نقطه عشق نمودم به تو هان سهو مکن

ور نه چون بنگری از دایره بیرون باشی

وسلام علیکم و رحمة الله